## پێشکەشە بە

- ڕۆحی پاکی باوکی کۆچکردووم و بە حوکمی لەدایکبووی هەڵەبجەیە و تەمەنێکی لەوێ بەسەر بردووە و دۆستی نزیکی شاعیر (گۆران) بووە و وەباوکیشی واتا باپیرم دۆستی شاعیرانی ناوچە بووە وەک (ئەحمەد موختار جاف و کەمال عەلی باپیر ئاغا... هتد). بۆیە یادگارەکانی خۆی لەگەڵ ئەواندا بۆمانی گێڕاوەتەوە.. بەمە گەرای هۆنراوەی لە دەروونمدا چەسپاندووە.
- گیانی بێ گەردی دایکی خوالێخۆشبووم، کە ناڕاستەوخۆ چرای شیعری لە دڵی مندا هەڵگیرساندو بەهۆی هاموشۆکردنی شاعیر (بورهان جاهید دۆغرەمەچی) لە (هەولێر)ەوە بۆ (ڕواندز) بۆ ماڵە خۆمان و بە خوێندنەوەی شیعرە نایابەکانی.. تا جارێکیان دوای ئەوەی شیعری گوت و ڕۆیی.. خێرا دایکم ڕووی دەمی کردە باوکم و گوتی: (بەڕاست سەیرە.. شاعیر چۆن بۆی ئەکرێ شیعر دابنێ؟!).. من بەم هەست و عەقڵیەتی منداڵیمەوە لە دڵی خۆمدا، بڕیارم دا و گوتم: (ئەبێ من ببم بە.. شاعیر).
- شاری زێدو زێدە ئازیز، ڕواندز.. کە کۆمەڵێ شاخی سەر کەش و ناوداری لە ئامێز گرتووە و دیمەنێکی دلڕفێن و تەلیسماوییان خولقاندووە و هەستی مرۆڤ ئەجووڵێنێ و بەهرەی شاعیر ئەتەقێنێتەوە... باوەکو من بە تاقە باڵەوە، بێ پەناو ڕابەر، وەک هەر زوومی بێ پەدەر لە ئاسمانی ئەدەب و هونەردا هەڵفڕیوم وەلێ ساتە ناساتیش سەبارەت بە نابەڵەدیمەوە، خاو بوومەتەوە و ڕووخاوم و دابەزیوم.
- گشت مرۆڤێکی ڕاستگۆ.

**سامی ڕواندزی**

**٢٠٠٢/١/٨**

# پێشەکی

**کەریم شارەزا**

گۆرانیی شەوگار بەشێکە لە هۆنراوەکانی شاعیر سامی ڕواندزی، کە لە نێوان سالآنی ١٩٦٢ و ٢٠٠١ داینـاون و هەندێکی لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکاندا بلآوکردۆتەوە، چونکە بۆی نەلـواوە هەموو هۆنراوەکانی بەسەریەکەوە لە دووتوێی دیوانێکدا بە چاپ بگەیەنێ، بۆیە ناو ناوە هۆنراوەیەکی لەسەر ڕووپەڕی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە بلآوکردۆتەوە و خۆی بە جەماوەری شیعر دۆست و ئەدەب پەروەر ناساندووە.

کاک سامی ڕواندزی شاعیرێکی واقیع بینە و هۆنراوەکانی لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە ڕیالیستین و کێشی عەرووزی و کێشی خۆماڵی کوردی بەکارهێناوە و لە کێشە خۆماڵییەکانیدا هۆنراوەی لەسەر کێشی پەنجەی ٦ بڕگەیی و ٧ بڕگەیی (٤+٣) و ٨ بڕگەیی (٤+٤) و ١٠ بڕگەیی (٥+٥) و یازدە بڕگەیی (٤+٤+٣) و دوازدە بڕگەیی (٤+٤+٤) و ١٥ بڕگەیی (٤+٤+٤+٣)، داناوە و لێیان سەرکەوتووە.

ئەگەر بمانەوێ هەندێ لە کێشی شیعرەکانی هەڵسەنگێنین واباشە بۆ نموونە چەند کێشێکی بخەینە بەر تەرازووی مۆسیقاو ئیقاعی شیعرییەوە. لەوانە: لە کێشی ٨ بڕگەییدا دەڵێ:

چاوەکانت / تەڕ نەکردوون = ٤+٤ = ٨
بە بارانی / دێوانە و شەم = ٤+٤ = ٨ ل:٤٢

لە کێشی ١١ بڕگەییشدا ئەم نموونەی بۆ دێنینەوە کە دەڵێ:

هەتا ئەمرم / بەحەسرەت تۆ / وە ئەمرم = ٤+٤+٣ = ١١
قەت دەرناچێ / چاوەکانت / لە فیکرم = ٤+٤+٣ = ١١

لەناو دڵما / مانگەشەوی / تابانی = ٤+٤+٣ = ١١
لەڕێی تۆیە / هەموو ئاواز / و شیعرم = ٤+٤+٣ = ١١ ل٢٣

لە کێشی ١٥ بڕگەییشدا ئەم نموونەی بۆ دێنینەوە کە دەڵێ:
ویستی بگرم / مەلی شیعرم / بەهار هێشتا / ساوابوو
تێی تەقاند زوو / بەرز فڕی / وەک خۆری گەش / ئاوا بوو
٤ + ٤ + ٤ +٣ = ١٥ بڕگە ل: ١٠٢
ئەگەر لە هۆنراوەکانی شاعیردا بە دوای وێنەی شیعری و هونەری ڕوونبیژییدا بگەڕێین، گەلێک وێنەی جۆراوجۆرمان دەکەوێتە بەرچاو و هەست وەک ئەمانەی خوارەوە:
شاعیر لە ڕێگەی پێکەوەنانی هونەری لێکچوواندنێکی جوانەوە، وێنەیەکی چەسپاوی شیعرییمان لە باری بێ ئاگایی بۆ دەخولقێنی و گەش و گۆڵیەکی بەرچاو بە هۆنراوەکەی دەبەخشێ، هەر وەک لەم دێڕە شیعرەیدا کە لە هۆنراوەیەکیدا بە ناوی ڕۆژی هەینی دایناوە و دەڵێ:

شیعر ژانە، جێی ئەهێڵم درک و داڵی هەورازە
هەرزەکار بووم، مەرگی باوک هێنایەڕوو ئەم ڕازە ل١٠٢

شاعیر لە ڕێگەی لێکچوواندنی پاراو و ڕەوانی (شیعر) بە (ژان)، وێنە شیعرییەکەی خولقاندووە و لە ڕێگەی هەستی دەروونی و بینینەوە وەردەگیرێ.
شاعیر لە هۆنراوەیەکی دیکەیدا لە ڕێگەی پێکەوەنانی هونەری خواستن وێنەیەکی گەش و گۆڵی شیعریی بۆ خولقاندووین، هەر وەک دەڵێ:

ئۆتۆمۆبێل لە ڕۆشتنا
دەیان لۆفە بۆ پێشوازیی دێنە ڕێگەی
تا لە نێزەی دارو بەردو شاخ و ڕووبار
سەلامەت بێ و ئاسوودە بێ سەفەرەکەی!    ل:٥١

شاعیر لە دەربڕینی (دەیان لۆفە بۆ پێشوازی دێنە ڕێگەی)دا هونەری خواستن پێکدێنێ و وێنەیەکی جوولاوی شیعریمان بۆ دەخوڵقێنێ. هەروەها شاعیر کە دەڵێ:

گەر هەموو جوانییەک کۆ بکرێتەوە
ئەستەم جێی پەنجەی ئەو بگرێتەوە    ل:٦٨

ئەمەش وێنەیەکی جوانی شیعرییە. ئەمە بوو کورتە پێشەکییەکی ئەم کۆمەڵە شیعرە و داوای سەرکەوتنی بۆ ئەکەم.

٢٠٠٢/١/٥

# گۆرانیی شەوگار

**سامی ڕواندزی**



# پەریی ئاسمان (١)

گۆرانی

پەریی ئاسمان رەنگ ئەرخەوان
یاری چاو کاڵ گەردن بەخاڵ
پەری .. پەری .. پەری
بام بە هەڵبەست دەرخەم مەبەست
مەبەستی دڵ دڵی بە کوڵ
پەری .. پەری .. پەری
دڵ دەمێ بوو هۆشی نەبوو
هەمووی بۆ تۆ چاو وەک هەڵۆ
پەری .. پەری .. پەری
جا ئەگەر تۆ کەوان ئەبرۆ
دڵت سووتا بە من ئێستا
پەری .. پەری .. پەری
گوڵت دا پێم دڵت دا پێم
بەیەک دەگەین ناحەز دەخەین
پەری .. پەری .. پەری

هەولێر ١٩٦٢/٣/١

---

(١) أ- بەرواری ١٩٦٢/٣/٣١ لە ڕۆژنامەی هەولێر بڵاوکرایەوە
ب- ئاوازم بۆ داناوە.

(گۆرانی)

# سوپاست ئەکەم [١]

سوپاست ئەکەم، سوپاسی بەجۆش
تا گیان لە ژینە نایکەم فەرامۆش
شووشەی گوڵاو و نامەی دڵداری
شایەت و بەڵگەن بۆ وەفاداری

* * *

دڵ و دەروونم پڕ لە سوپاسە
بۆ ئەم پەیمانەی تا دوا هەناسە
لە یادم ناچی دڵ نادەم بەکەس
تۆی خۆشەویستم، بۆ تۆ ئەژیم بەس

* * *

پەیمان پەروەریت مژدەی بۆ هانی
فرمێسکم ڕژاند هی کامەرانی
گڕی دڵدارییم گڵپەی بەرز بوو
بەرەو ئاسمان و ئاسۆی ئومێد چوو

* * *

---

(١) أ- بەرواری ١٩٦٢/٩/٢٥ لە ڕۆژنامەی هەولێر بڵاوکرایەوە
ب- لە ڕێبەندانی (١٩٧١) ئاوازم بۆ داناوە.
ج- هونەرمەند (عبدالله دڵسۆز)یش ئاوازی بۆ داناوە لە ڕادیۆی بەغدا بڵاوکراوەتەوە.

## ١٣

من بەختیاری تاسە و پەیمانم
بەشکو دەرکەوێ ئەستێرەی ژیانم
وێنەی مەم و زین دڵداری بکەین
ورە بەر نەدەین تا بەیەک ئەگەین

ڕواندز ١٩٦٢/٩/١٥

# هەستێکی ڕوون[١]

له قووڵایی دڵ و دەروون
هەڵئەڕێژم هەستێکی ڕوون
ئەیخەمە سەر خونچەی نیان
پڕ شەونمی بەری بەیان
بە دیارییەوە بۆت ئەنێرم
شەتڵی ئەڤین پێی ئەدێرم
بەتاسەوە سەربەست ئەڵێ
نەتبیستووە ڕازی دڵێ:
کە دڵبەندی باڵاکەتە
خولیای خەت و خاڵەکەتە؟
تۆ تاقە دڵبەستی ئەوی
هەتوانی خەستی ئەوی
گیان.. وەرە سا با گیان مەست کەین
ناسۆرو زام بڕێ سست کەین
بشێوێنین شەوی تاری

(١) أ- له ڕادیۆی بەغدا بڵاوکرایەوە
ب- له (کەشکۆڵی گیو) بڵاوکرایەوە

به ئەسرینی بەختیاری
بدەین پەیمان تاکو نەمان
دوو جەستە بین، یەک تاقە گیان
تا بەیەک گەین دڵشاد بین زوو
بژین بە جووت پڕ ئارەزوو

ڕواندز ١٩٦٥/١١/١٠

# شیوەن بۆ
# مامۆستا جەلال خەیلانی[(١)]

ئەی چاو برێژە ڕۆندکی خوێنین
ئەی دڵ دەست بە چۆک دانیشە بۆشین
قوتابیانی شار، وانە نەخوێنن
مەلان، پاساران، هیچ نەجریوێنن
بانگەوازێ کەن: کەس بۆ کار نەچێ
ئیمڕۆ ڕواندز لە جاران ناچێ!!
ئیمڕۆ مامۆستا جەلال خەیلانی
لە ڕەوتی تەمەن کۆتایی هانی
میوانی خاکی پاکی گەردە گەرد
دەست لە ملانێمان خەزانی قژ زەرد
بێ وزە و ئارام دەم نایەتە گۆ
بۆ خوا پەرست و هێمن و لەسەرخۆ
بۆ جگەر سۆزی قوتابی و وانە

---

(١) أ- لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە
ب- ناوبراو بەڕێوەبەری دوا ناوەندی ڕواندز بوو لە بەرواری ١٩٦٥/١١/٣٠ بە نەخۆشییەکی کتوپڕ ماڵئاوایی لێ کردین.

نەوای نووتەکی دۆست و بێگانە
بۆ باوکی نزار، ڕواندز ئەگری
ڕەشی پۆشیوە ئاسمان و هەوری
زیندووە هەردەم دەشنێ و لە یادە
بە یەزدان پەنا بە بەهەشت شادە

ڕواندز ١٩٦٥/١٢/١٢

دوو هۆنراوە

(١)

# ئاواتی من[1]

دڵدار دیدەنی دولبەری خۆی کرد
گـەڵای خەزانـی خەمـی هەڵـوەری
بولبول بۆ گوڵزار تاسەی پەنای برد
دەم بە ستران و مەست بوو هەڵپەڕی
تەنیـا ئاواتـی مـن نەبـێ زوو مـرد
یار بەجێی هێشت و نەبووە سەنگەری
بۆیـە ئەزانـم تـا دوایـی ژینـم
کۆسـت کەوتووم ئیتـر خەندە نابینم
بۆیـە ئارامیـم زینـدە بەچـاڵ بـوو
لـە مێـرگ و باغـی خەنـدە بێ بەری

ڕواندز – ٦٦٩١/١١/٩

(١) لە ڕۆژنامەی (دەنگی میللەت) ژمارە (٧) بڵاوکرایەوە

(٢)

# پێت نا لەجەرگم

پێت لە لە جەرگم لە ناخی بیرم
هێشتاش پێم ئەڵێی من جوان نیم و پیرم
مۆتەکە دای بە خاکا پشتم
ئاخێ هەڵکێشە و بڵێ: من کوشتم

# گوڵی کەم تەمەن[١]

خۆزگە نەشمیلی
چنگاڵی دیلی
خۆزگە دڵی من
بۆ دۆست و دوژمن
وەفات بێ قومری
هەر بۆ خۆت مەگری
منیش وەکو تۆ
جگەرم بە سۆ
منیش گیرۆدەی
سەرمەستی بادەی
چەند هەڵوێست خۆش کەم
هەستم بەجۆش کەم
گشتی بێ سوودە
ڕەنجی بێ هوودە
ئاوا خۆم دیوە
گوڵم نەچنیوە
خۆزگە نەشمیلی
چنگاڵی دیلی

گوڵی کەم تەمەن
نایکرد بێ سەمەن!
ڕەق با وێنەی بەرد
نەیبا ئاهی سەرد!!
مەلی بێ چارە
بۆ منیش جار جارە
نەگبەتم ئاخر
دڵم وەک ئاگر
داوی خەفەتم
خەم و حەسرەتم
یارمەتی بدەم
بۆ شادی و ماتەم
تەلیسم و سیحرە
پێم ئێژێ بمرە!
بەدرێژی تەمەن
لە باخ بەدەگمەن
گوڵی کەم تەمەن
نایکرد بێ سەمەن

ڕواندز - ١٩٦٨/٨/١٠

---

(١) لە ڕۆژنامەی (بەهرە) بڵاوکرایەوە

# بۆ زاهیدی کوڕم[١]

زاهیـــــــد گریەکـــەت ئاوازی دڵمە
چرۆی بێ بەری ســــــەر پۆپەی چڵمە
وەک لە ئێســـتەوە ورد بێ بیرەکـــەت
نابینـــا و کـــــوێرە نووکــــی شیرەکەت
تووێڵ هەســت ئەکـەم ناڵەی منداڵیت
خـەم مەخۆ بەرخە جارێ تۆ کاڵیت
تازە سـێ مانگە ڕسـتەی ژینەکەت
پێم بڵــێ چییە کــامی شینەکەت
پێخەفت گــــەرم و شیرت ئامادە
لای لایـــەی دایە دەکـــاتە جادە
هانێ وا دەرمـان ئەگـــــەر نەخۆش بی
سەیرانی هۆما لە گـــیانت نۆش بی
ئەگـــــەر خەمناکی پشیت بــێ بـا بێم
خەنــــدە بڕێـــــژم ئـــاوازێ بڵێم
لەمـــــانە پتــر ئیتر شــک نابــەم
چاوی کۆمەک و دەست ڕازەی کەس ناکەم!

❊ ❊ ❊

---

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

ئەترسم ڕۆڵە بۆ باوکـــت بگری
باوکـــی موبتەلای ڕێبازی قومری
من قنیاتم دێ بەڕوخســـاری خەم
ئەڕۆم بە شوێنیا گەر بەردا یەخەم
مەڕەنجێ، مەگـــری، با بنووین هەردوو
بڵقی سەر ئاوە کـــڵاوی با بـــردوو

ڕواندز - ١٩٦٨/٢/٦

# ئێوارەیەکی تەماوی[١]

ئەی شۆخ ئەم ئێوارەیە
تیشکی خۆر ئاوارەیە
هەورە بارانە تەمە
دۆستی گریە و ماتەمە
لە دوورەوە ئەتبینم
سەرسامییەک ئەنوێنم
چونکە هەست ئەکەم کزی
هەر بۆ تەنیایی ئەخزی
هەموو ڕۆژێ لەم جێیە
لەم هەوارە نوێیە
شاعیرانە وەستاوی
مات و کپ و داماوی
هەرچەندە زۆر بە وردی
سەیری شێوەم کە کردی
وێڵی بووم و نەمزانی
بۆ مات و پەرێشانی؟!
بۆ هاوڕازی تازەکەت
نەخشە ئەکا نازەکەت؟
بۆ ئەو کەسەی کە شەوێ
لە باوەشتا ئەخەوێ
لەژێر سێبەری ئاوات
دەم لەسەر ناسکی گۆنات
ئەمژێ تا هێزی هەیە
لەم جوانی و بەهرەیە
داوەت بۆیەک دەگێڕن
ڕازتان بە گوڵ دەسپێرن
بەڵام ئێستا بێ بەشی
لە دڵدار و باوەشی
بۆیە تەنیایی خۆشە
یادکردنەوەی بە جۆشە؟

❊ ❊ ❊

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

یان بڵێی یادی دێرین
یادی ڕابردووی زێڕین

یادی خۆشەویستیمان
شنەی شادیی مەستیمان

دوای نەمانی دڵداری
تەمەنی بەختیاری

زانیت خۆت تاوانباری
لەئەویندا بێ باری

بێ چارەو پەشیمانی
تازە نرخی ئەزانی

حەز ئەکەی دڵدارت بم
داڵدەی خەم و زارت بم

داوێکی کەم بۆ ڕێکخەی
بە دەگمەن نەڵێم ئۆخەی

خەڵکی لای یەک باسم کەن
بە تیرو توانج کاسم کەن

نەء تۆراوم بێ گومان
سەرچڵەکەی بێ پەیمان

من دڵی خۆم خۆش ئەوێ
گرفتی بۆ بەرکەوێ

بەشوێن ئەڤینی تازە
ببێژە ئەم ئاوازە

ڕواندز – ١٩٦٩/١١/٢

# بەخێر بێی[١] (گۆرانی)

ئۆخەی بەخێر بێی گیانی شیرینم
سوپاس سارێژ بوو زام و برینم

❊ ❊ ❊

کاتێ ئەتبینم ئەگەشێمەوە
لە ماندووبوونما ئەحەسێمەوە

❊ ❊ ❊

پەرچەمی ڕەشی سەر نەوجەوانت
ڕەوتی کۆتری باڵای نیانت

❊ ❊ ❊

منیان شەیدا کرد ئەندام گوڵاڵە
خەو و خەیاڵم کاڵ و بەتاڵە

❊ ❊ ❊

بۆیە بەم جۆرە لە لام ئازیزی
زۆر میهرەبان و ژیر و دڵسۆزی

ڕواندز - ١٩٦٩/١٢/٢٢

---

(١) أ- ئاوازم بۆ داناوە
ب- لە گۆڤاری (نەواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

# جوانی سەرنجڕاکێش(١)

ساوایە بەهار، چواری ئازارە
بەفر تۆراوە، بزەی گوڵزارە
پیر بەختیارە و جەژنی دڵدارە
ڕۆژێکە خۆشتر، لەساڵی پارە!!

❊ ❊ ❊

خەڵکی ڕازاوەن، هاتوون بۆ سەیران
پۆل پۆل دانیشتوون، دەروون کامەران
لە ناز و لەنجەن، دۆست و دەستگیران
گۆرانی ئەڵێن بۆ ئاسۆی ژیان

❊ ❊ ❊

منیش ڕێی وێڵم، بوو بە بەشداریێ
دۆستێ لەگەڵما، بەختیارم جارێ!
بەجووت ئەڕوانین، بۆ شاخ، ڕووبارێ
دیمەنی دڵگیر، ژێر بنەدارێ

❊ ❊ ❊

گەشتر بوو دڵم، کە نیگات دا پێم
پرشنگی چاوت گڕ بەر ئەدا تێم

---

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

ئا بەم ئافتاوە و بەهارە ئەڵێم
بۆچی هەنگاوی تاریکی ئەنێم

*　*　*

ئەبینم خەڵکی سەیری شۆخ ئەکەن
کام ڕاکێشەرە پەنای بۆ ئەبەن
ڕاکێشەر هەر تۆی، شیلانەی گوڵشەن
برۆ و برژانگ و ، ئەم چاوە ڕەشەن

*　*　*

خاڵۆی شکاکیش، ئاخی هەڵکێشا
لەگەڵ مژی قووڵ، جگەرەی کێشا
وتی: (کردگار چۆن نەخشی کێشا
کەی قنیاتم دێ بەیەک تەماشا)!

*　*　*

گەر خەوش نەبا ئەچووم بۆ لای پیر
پێم ئەوت خاڵۆ، ڕێبواری دڵگیر
ئەم گوڵەندامەی بوو بە گڕی بیر
هۆگری لاویم بوو، ئێستاکە زویر

*　*　*

جیا بووین لە یەکتر هەر یەک بۆ لایێ
دڵ ئەخاتە گڵ داخی لەیلایێ

ڕواندز - ١٩٧٠/٣/٤

# ئەوە هاتەوە[١]

(گۆرانی)

ئەوە هاتەوە بەهاری بەسۆز
بەدەم مزگێنیی ڕۆشنایی نەورۆز
سا دەستت بێنە شۆخی چاو مەستم
بلاوێنەوە خونچەی مەبەستم

❊ ❊ ❊

وەرە بابڕۆین بۆ سەیران و گەشت
وڵات ڕازاوە بە وێنەی بەهەشت
لەم شاخ بۆ ئەم شاخ لەم گوڵ بۆ ئەم گوڵ
بادە بنۆشین بە ئارەزووی دڵ

❊ ❊ ❊

با لە دڵ دەرکەین خەم و ناسووری
سەختە، دۆزەخە، دیدەنی دووری
بەمن چی جوانی ڕێک و نەشمیلی
لەتەک خۆم نەبی ئەژیم بە دیلی

رواندز - ١٩٧٢/٣/٤

---

(١) أ- ئاوازم بۆ داناوە
ب- هونەرمەند (شەوکەت تۆفیق)یش ئاوازی بۆ داناوە و لە ڕادیۆی بەغدا تۆمار کراوە.
ج- لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە.

# پرسیارت لێ ئەکەم[١]

(گۆرانی)

پرسیارت لێ ئەکەم هەواڵت چۆنە
هەروەکو جاران قژت بە بۆنە
بەزەییت هەبێ دڵم مەشکێنە
بەیادی هەرزە نەختێ بمدوێنە

❊ ❊ ❊

ئاواتی تۆ بووم هۆشت بێتەوە
دڵ گۆڕان لە تۆ ناوەشێتەوە
کەی من غەریبم، هۆگری دێرینم
سەرێ هەڵهێنە خەندەت ببینم

❊ ❊ ❊

لە چۆڵی ژینا، داماوم، سەرسام
هەناسەم سارد و بێ کەس و تەنیام
تۆم هەبوو تەنیا دڵم پێ مەست کەم
تۆ بەجێت هێشتم لە خەرەندی خەم

ڕواندز - ١٩٧٢/٤/٢

---

(١) أ- ئاوازم بۆ داناوە
ب- لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە بە دەستکارییەوە.

# بۆ گیانی زیرەك[١]

مەلی شوومی پەژارە
متووی کوردی هەژارە
پرسەی هونەر تاسەیە
ئامادەی ئەم باسەیە
دەڵێ (زیرەک) کۆچی کرد
سترانبێژی مەزنی کورد
دوای بەهاری حەوتا و دوو
ناڵەشکێنەی مەنزڵ بوو

* * *

وتم کەواتە کام دەنگ
ئەشێوێنێ شەوە زەنگ
کێ دەبتە باوکی بەستە
دوو هەزار لە یەک ڕستە؟
بەدەنگی زوڵاڵی ساخ
بلەرزێنێ دڵی باخ؟
کێ بێ ئیدی شارو دێ
ماڵ و یانە و جادە و ڕێ
پڕکا لە ئاهەنگی خۆش
لە لایە لایەی بەجۆش؟
کێ بێ شەوگاری دڵدار
بیترازێنێ لە پەژار؟
بەدەنگی زەنگی شاد بێ
چاوی کاڵی لە یاد بێ
کێ بێ هێندە لە جوانی
ئافرەتی کورد بزانی؟
باڵای شۆخ و قژی زەرد
خەندە و ڕوومەتی بێ گەرد
بەم شێوە بیکا باسی
جیهان پاکی بیناسی

* * *

(١) لە برایەتی بڵاوکرایەوە

## ٣١

گڵپەی یادی زیرەک گیان زیرەکی بە کوردستان
زیرەک و هونەرمەندی کەوی کێوی سام ڕەندی
کورد بێ گۆرانیبێژ بوو کە تۆی بلبل لە دەست چوو
کێ جێگەت ئەگرێتەوە ناوەکەت ئەسڕێتەوە
سا بنوو خوا لێت خۆش بێ گوڵزار لە گیانت نۆش بێ

ڕواندز - ١٩٧٢/١١/٢٣

# خۆشەویستەکەم(١) (گۆرانی)

خۆشەویستەکەم هەستە بەهارە
بۆچی، لەبەر چی دڵت بێزارە؟

❋ ❋ ❋

بۆ هەر لا ئەڕۆی قەڵبەزەی ئاوە
سەوزە گیای نەشمیل دەورەی لێداوە
چیمەن بەلالە و شالۆر ڕازاوە
سڵاو ئەنێرێ بۆ بووک و زاوە

❋ ❋ ❋

تیری موژگانت جەرگی بڕیوم
بوو بە نەشتەری دڵی هەتیوم
بەزەییت هەبێ بزە نەدیوم
وێنەی باڵداری باڵ هەڵوەریوم

ڕواندز - ١٩٧٣/٤/٣

---

(١) أ- ئاوازم بۆ داناوە
ب- لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

# جەمێکی تاڵ[١]

بۆچ نەتهێشت جەمم بخۆم      بۆچ بووی بەخونچەی پەرژین
بۆچ پێت چێشتم مەرگی خۆم      بەخەندەی لێوی خوێنین

❊ ❊ ❊

بۆچ تاسەت لێ لێخن کردم      چەند حەز و ئارەزووم بوو
هەست و نەستت لێ سەندم      بەپرشنگی مانگی ڕوو

❊ ❊ ❊

نـاڕەوا ئەمــپــرژێـنـی      وەک تکەتکەی بەر دەمم
ڕوندکم پێ ئــەڕژێـنــی      گڵپە ئەسێنێ خەمم

❊ ❊ ❊

بۆ هاتی، بۆ ڕۆیشــتــی؟      ئارامبارباى ئەهاتم
سکــاڵام لا ئـەڕشــتی      چەند ماخولیای باڵاتم

❊ ❊ ❊

تۆ ستەمکار و من داماو      چۆن خوێنی دڵت مژتم
وەک خۆر دەرچووی لە ناکاو      لە ناکاویش جێت هێشتم

ڕواندز - ١٩٧٣/٧/٥

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

# نەشێوێنی پێکەنین[١]

نەشێوێنی پێکەنین
خەندەت لێ دێ نازەنین
تا تاسەی دڵ بسرەوێ
ساتێ لەگەڵما بدوێ

❊ ❊ ❊

بەفـــر بارینە وەرە
بەر دەرگا و بەر پەنجەرە
تۆ بە بەفــر هاویشتن
مایەی پەژارە کوشتن

❊ ❊ ❊

خۆشە لاوی و دڵداری
لە سایەی بەختیاری
بەجووت هەردوو دانیشین
شادم بکا چاوی شین

ڕواندز - ١٩٧٤/١/٧

---

(١) أ- لەسەر داواکاری تیپی مۆسیقای (پاشای گەورە) لە ڕواندز دانراوە لەسەر ئاوازی موەشەحی عەرەبی (لما بدا)
ب- لە ڕۆژنامەی (بەهرە) بڵاوکرایەوە

# پەرێشانم[١] (گۆرانی)

پەرێشانم، پەرێشانم ڕەحمێ بکە بە دڵ و گیانم
پەست و ژاکاوم نابینێ چاوم

من پەرێشانم
چاوی کاڵ و دانەی خاڵت
باڵای بەرز و لێوی ئاڵت
مەستیان کردم
هەستیان بردم
ساتێ وەرە لام یاری نازەنین
بەشکو ببینم خەندە و پێکەنین
بۆ پەشۆکاوی
دوور وەستاوی

ڕواندز- زستانی ١٩٧٤

---

(١) أ-ئاوازم بۆ داناوە.
ب- لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە.

# دەمەتەقێی[١]

مەسیفی و ڕواندزی

م:     گوڵێ وەک دڵی یاران شێواو بێ
لە مانگەشەو زیاتر داماو بێ
باخچەی ئەم گوڵە ئەبێ کام شوێن بێ
لە باغی کوێستان یاخود گەرمێن بێ؟
ر:     ئەم گوڵە ئاڵەی کە تۆ باست کرد
لانەی وێرانی دەروون کاست کرد
کاکی مەسیفی خاکی کوردستان
دەشتی گوڵی وا لە باخی کوێستان
م:     مادام ئەم گوڵە لە خاکی خۆمە
دڵ فەرامۆشە و پشتم بۆی کۆمە
وەلێ تەنیاییم پڕە لە لۆمە
کوانێ ئەو ڕۆژەی بڵێم هی خۆمە
ر:     نەچی بەشوێنی کڵاوی با بردوو
چونکە تەمەنی کورت بوو بەسەر چوو

---

(١) لە ڕۆژنامەی (دەنگی میللەت) بڵاوکرایەوە

هەیە حەوت ساڵان دڵداری بووە
مەزرای بەرەکەت لەدەستی چووە
**م:** کاکی ڕواندزی دڵ مەخەرە جۆش
ئەندێشەی شیعرم مەدە بە خۆفرۆش
تیری دوو چاوان بزەیەکی خۆش
کێ ناشێوێنێ شەرابی بێ هۆش
**ر:** کەوا بێ ئێستە تەمە کوردستان
کە گۆڕا ئەستەم بە نێرگزستان
بچوو بە شوێنی یاری گوڵ سینە
بە ورشەی چاوان دڵی بسێنە

ئێران - نەڵیوان - ١٩٧٤/٦/٢٧

هەتا ئەمرم بەحەسرەت تۆوە ئەمرم[(١)]
قەت دەرناچێ چاوەکانت لە فکرم
لەناو دڵما مانگە شەوی تابانی
لە ڕێی تۆیە هەمووی ئاواز و شیعرم

ئێران - نەڵیوان - گەلاوێژی ١٩٧٤

---

(١) لە ڕۆژنامەی (بەهرە) بڵاوکرایەوە

# شۆخی بۆکانی[١]

شیرینە شێوەت شۆخی بۆکانی
بەلەنجە کاتێ ئەچی بۆ کانی
بە کل ڕشتووتە چاوی بووکانی
بزەی بەزەییت نییە بۆ... کانی؟

❊ ❊ ❊

نامۆ و نابەڵەد کوڕی بۆکان نیم
دیمەنی بەژنی بەهاریت کە دیم
تیری موژگانت تەماوی تەنیم
شێوا سەفەرم ئەستەمە بژیم

❊ ❊ ❊

نوقمی سەد جۆری بەرگی ڕەنگینی
وەک گەردانەکەت مەست و سەنگینی
زانیت بە جوانی و باڵا زەنگینی
سەرابە لەلات چێژی غەمگینی

❊ ❊ ❊

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

زوڵفت قولابی لە دڵمی ناوە
ئاواتی منە ئەم جووتە چاوە
تاقە تیلایێ، سۆز و سڵاوە
ئاگادارم بە: دڵم شکاوە!

ئێران - شنۆ- ١٩٧٤/١١/٣

# من نەخۆشم(١) (گۆرانی)

من نەخۆشم لەبەر تۆ          من ئاوارەم لەسەر تۆ
تۆ لەوێ و من لێرەوە          تکا ئەکەم بێرەوە

❊ ❊ ❊

تۆ بەجلی سەوز و سوور          بەسەر کوڵمەی پڕ لە نوور
پەروەردەی کامەرانی          بۆ غەریبان ناڕوانی

❊ ❊ ❊

لەگەڵ تۆیە خەیاڵم          چراخانی بۆ ماڵم
لە غەریبیت جێ هێشتووم          ژاری مارت پێ چێشتووم

❊ ❊ ❊

بڕوا بکە نەخۆشم          چوو لە دەستم گشت هۆشم
گەر خەندەت بشنێتەوە          خەفەت سەر دەنێتەوە

ئێران - ڕەبەت -١٩٧٤/١٢/٥

---

(١) أ- ئاوازم بۆ داناوە
ب- لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

# شیرینە[١] (گۆرانی)

شیرینە باڵای یار
شیرینە لەنجە و لار
شیرینە ڕۆیشتنی
هەڵسان و دانیشتنی

❊ ❊ ❊

شیرینە پێکەنینی
لە تەک لێوی خوێنینی
ڕوومەتی مانگەشەوە
چاوی هەردەم لە خەوە

❊ ❊ ❊

برژانگ تیری بە ژانە
خاڵی لەسەر لێوانە
لە دیمەنی سەرسامم
بێ قنیات، بێ ئارامم

ڕواندز – جۆزەردانی ١٩٧٦

---

(١) أ- ئاوازم بۆ داناوە
ب- لە ڕۆژنامەی (بەهرە) بڵاوکرایەوە

# نازە[1] (گۆرانی)

نـازە نـاز مەکـە نـازدار و نازەنینـی
سـەرچاوەی بەهـرە و بەهـار و پێکەنینـی
نازە.. نازە
نـازەی ناسـک و ئاسـکەکەی بەختـی ڕەشـم
بهێڵـە سـاتێ لـە باختـا بلـوێ بەشـم
نازە... نازە
پڕشـنگدارە ڕووی خۆرەتـاوی بەیانـی
دڵگـرە چـاو و قـژ و بۆنـی ڕەیحانـی
نازە... نازە
نەگـۆڕی دڵـت پابەنـدە دڵ و مەیلـم
تـا دوا چرکـەی ژیـن بـێ تۆ خەمناک و کەیلم
نازە... نازە

ڕواندز – ١٩٧٦/٨/٧

---

(١) أ- ئاوازم بۆ داناوە
ب- لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

# بۆ خوشکی هونەرمەند ئامینە[1]

هونەر شیرینی خوشکی هونەرمەند
دەستکرد ڕەنگینی شاناز و پەسەند
سوپاس بژێرم ئافرەتی شارم
هونەر بزانێ، بسازێ کارم
چرای ئافرەتی بەرهەمت ڕەمزە
باخمان ڕازاوە و، بەهارمان سەوزە
بۆ قوتابخانەت ڕۆشنایی و مژدەی
بە تۆ شایانە مامۆستای مژدەی
بژی ئەم دەستە و ئەو هەستە پاکە
خوشکە ئامینە شیعرەکەم چاکە؟
خولیای وەڵامتم وەلێ بەهەڵبەست
تەنیا بە شیعر ئەگەم بەمەبەست

ڕواندز - ١٩٧٧/٤/١١

---

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

# ڕاسپاردە[١]

کە باڵی کێشا نێرراوی ئاسمان
با ئاگادار بێ لە ڕەشماڵی گیان
پەڵە هەورەکەی ئاسمانی دڵم
جیایە، دژوارە، ناسۆرە چڵم
بپرسێ جارێ لە کەلەکەی چەپ
بۆ ئاڵۆزاوە وەک گەردوونی تەپ
جا با لەسەرخۆ گیانم بکێشێ
چۆن ئارامگای یار ئازار ئەچێژێ
بزانێ دەردی کڵۆڵی ژیان
چۆن ئەدرکێنێ دڵەی پڕ لە ژان
کە بزەی سۆز و لاویم هەڵهێنا
پڕشنگی چاوی یار کەوتە بینا
ئەو چاوە جوانەی جوان پێی سەرسامە
بەهرەی هونەری و پەنا و هیوامە
دەشنێ لە یادا لە گشت شێوەی ژین

---

(١) أ- لە ڕادیۆی بەغدا خوێندرایەوە
ب- لە (برایەتی) بڵاوکرایەوە

له خەندە و ئاهەنگ لە لایەلایەی شین
لە تاسەی سروەی بێخاڵی جوانە
لە سەهۆڵبەندی کەژی زستانە
لە قرچەی چلەی گەرمەی هاوینە
لە بەهاری شۆخ سەوزی نەرمینە
لە بێ ئارامی ڕەمـــەزانـی ســاڵ
برسی و تینووەتی دەم و زاری تاڵ
کام شوێن گوڵ گوڵە کام کات بەجۆشە
لەتابلۆی بیرم ئارام باوەشە
دەسا نێرراوی ئاسمانی یەزدان
تەرازووی کامیان گرانە لە کێشان؟
کێشانی هێزی ڕۆحی سەرسامکار
یان دڵ ئارامی یاری بەدەمار؟

ڕواندز – ١٩٧٧/٨/٢٨ – دوانزەی ڕەمەزان

# کەشتیی دەریا[١]

لە هەڵسوکەوتی بازاڕا
لە کەموکورتی ناو شارا
لە دەنگوباسی لابەلا
بۆ منی نامۆ، نا شارەزا
کێ لێزانە، کێ ڕێزانە؟
کێ ئەلندی کار و نانە؟
هەر تۆی هەڵبەت کەشتیی دەریا
کاک ئیسماعیل برای وریا
ئاگاداری منناڵیم
گوایە تافی کوڕوکاڵیم
نالەبار و ئەفسانە بوو
سەراسیمەی زەمانە بوو
تا تۆم ناسی، تۆم بەدی کرد
مەردانە تۆش، خۆت کرد بە پرد
چەشنی هۆما و پیاوچاک و مۆم
زۆر تاریکیت ڕۆشن کرد بۆم
هەزار سوپاس بۆ خوای مەزن
کەشتیی دەریای بەخشی بە من

ڕواندز - ١٩٧٧/١٢/٢٣

---

(١) أ- مەبەستم برای دڵسۆز و بە ئەمەکم مامۆستا (اسماعیل عبدالله)یە
ب- لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

# شاری ڕواندز[١]

ئەملا گەلی ئەولا خەرەند
یاساوڵی شاری دڵمەند
بازنەی سنوور شاخی ناودار
بکەی گەشە و بزەی دڵدار
کوڕەک، بێجان، زۆزک، گۆڕەز
چاوگەی مازوو و باڵدار و پەز
ئارمووشەی شۆخ، هەندرێنی شەنگ
چاو ئەگێڕن بۆ حەسەن بەگ
بووکی ناسکی نێو کەژاوە
بەناز سەری دەرهێناوە
لە ئامێزیا چەپکێ نێرگز
سەربەست ئەڵێ: ئەی ڕواندز
شاری پاشای میری سۆران
تەمی خەمی کوردی تۆران
وەستا ڕەجەب هونەرمەند بوو
داهێنەری تۆپی جەنگ بوو

---

(١) لە (برایەتی) بڵاوکرایەوە

ئەستێرە بوو شیعری نەزهەت
شاعیرێک بوو شەیدای میللەت

❊ ❊ ❊

بەهارانی گشت سەیرانگا
هەر شوێن مرۆڤ ڕووی تێ ئەکا
خۆشە مەلا وسوو و شێخان
وردە پیاسەی لای بەر باخان
بانە زۆک و بێرۆی بەرین
بۆ دیلانێ و خەندە و ئەوین
کورتە پیاسەی گەردە گەردی
ئەڕەوێنێ خەم و گەردی
هاوین بەڵگە لە ئارایە
بۆ گەشتیاران شەی پەنایە
بێخاڵ.. شادە و خۆی ئەنوێنێ
مەل بەخەندە ئەجریوێنێ
گەلی زۆر قووڵ لووتکەی چەپی
ئاو ئەڕژێنێ بەردی تەپی
هێند بەهێزە هاژە هاژی
کەڕو لاڵە قەل و قاژی
گەلی مێگر یان عەلی بەگ

خاڵە ڕەش و جندیای سەنگ
گشت ئارایشت ئاوی سازگار
ئارام بەخشی عیشقی ڕێبوار
پێشکەوتوو بێ شاری شۆخان
شاری پاشاو باغ و شاخان

ڕواندز – ١٩٧٨/٣/٣٠

## خالیدە[١]

خالیدە خونچە و سەیرانی ئاڵۆز
لێی چوون بەقیندا بەهار و نەورۆز
گەردە گەرد زانی هاتە کایەوە
وەک گەرووی ماسی قووتی دایەوە
هەل بقۆزەوە هۆ لاوی تازە
یەزدان بناسە بەخۆت مەنازە

ڕواندز – ١٥ / ٤/ ١٩٧٨

---

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

# خوێندنی تەوزیمی[١]

پیرۆزە یاسای تەوزیمی خوێندن
ڕێبازی بەرزی ڕەوتی سەرکەوتن
هۆی سەربڵندی و سروەی نیشتمان
چراخانەکەی شەوگاری گشتمان
تەوزیمی خوێندن دەروازەی پیرۆز
پاراوە و بێگەرد دەروونی پڕ سۆز
خوێندن تەمەڵی و سستی ناهێڵێ
کێڵگەی زانست و هونەر ئەکێڵێ
نەمامی چڕی شـاکـار ئـەڕوێنێ
پۆپەی بەختیاری مرۆڤ ئەنوێنێ
ئەڕمێنێ قەڵای سەختی زۆرداری
ئەدڕێنێ تارای بەختی بێزاری
دایکی نیشتـمـان کـامـەران ئـەکا
پڕ شینایەتی و دان و کان ئەکا
پڕ کارگە و دەزگا بەرهەمی بە سوود
سیمفۆنیای ساز و ئاواز و سروود

---

(١) لە گۆڤاری (هەنگ) بڵاوکرایەوە

خۆرەتاوی گـەش ئاسـۆیەکی شین
ئەیکا بە باڵای قەد چناری ژین
دەس لە گەردنی گەل و نیشتمان
وەک تاسەی کۆرپە و دایکی میهرەبان
هەل لە دەست مەدە ئیدی بخوێنە
داری نەزانین لە ڕەگ دەربێنە
خاکی چیمەنی گوڵ گوڵی دێرین
ببووژێنەوە بە مێشکی زانین

ڕواندز- ١٩٧٨/٥/٢

# خوا(١)

مامە سوورِانێی ئەم کەونە کەونە
بێ شومار ملیۆن ساڵ
ئەکا گرِوگاڵ
کێ ئەزانێ کەی ئەحەسێتەوە؟!
لە باوەشیا مرۆڤ ژیوە
بۆ لەتێ نان رِەنجی دیوە
لە تەک گریان پێکەنیوە

❊ ❊ ❊

بەساکاری زیندەوەران
تروو کاوە چاوی حەزیان
بەدەستی دیل، دیل کراون!
بۆ خوانی میر هەناردراون!

❊ ❊ ❊

درەخت، سەوزی، فرە تەرزن
هەڵگورد ئاسا گەردن بەرزن
نهێنیی خاکن: گەوهەر، ئاسن

❊ ❊ ❊

---

(١) لە گۆڤاری (پەیامی رِاستی) بڵاوکرایەوە

ئاسمان، باڵا، بڵند، بەرز

دەشنێ سۆزی لەسەر ئەرز

ڕای سپاردووە هەسارەکان

یاساوڵی زەوی بن

وەکو زەوی نەوی بن

❊ ❊ ❊

مانگ نازەنینە

بەندەواری زەمینە

عیشوە کارە، ئەلندارە

ئەدڕێنێ جەرگی شەو

بۆ ڕێبواری ماندووی بێ خەو

سۆمای چاوە، قۆناغی نەو

❊ ❊ ❊

هەتاو

کزرەی هەناو

سروەی سایە ئامێز نەبا

شانازی خاک، پاک ئەتۆران

کوا ختووکەی جەمی ئینسان؟

کوا بژێوی ڕۆحی بێ زمان؟

❊ ❊ ❊

موحەمەد (د.خ) پەیامبەرە
چرۆ و شکۆفەی ڕابەرە
بە سوێی قورئانی بەفەڕە
توحفەی پەروەردگارە
بۆ جێگری نەخوێندەوارە
زانست بە سایەی بریسکەدارە
بڕوا پتەو، دەروون زوڵاڵ، بمانبەخشە
بۆ ئاگر نابین هۆگر
بەهەشت لە خۆمان کردووە نەخشە

ڕواندز – ١٩٧٨/٦/٥

# کەوی دڵی لالەزار[(١)]

کـــــەوی دڵـــی لالــەزار
وەنەوشەی لێوار ڕووبار
شەوی تارن زولفی ڕەش
برۆ، برژانگ، چاوی گەش
گـــەزۆی کوێستانە گۆنات
گەردن، سینە، گشت باڵات
نیگـار و جـوانتـــر لە زین
رەوشت بەرز و خوێن شیرین
نیگـــــار و هیـــوای پیری
هـــامڕازی خوێن و بیری
ئەســـــــتەمە مەیلت بنێم
بە هـــــی تر (گیانە) بڵێم
بە هـــــی تر بدەم پەیمان
دڵ و فرمێســک و سامان
بە هـــــی تر تاسە نۆش بم
لە ئارامگــــــای خامۆش بم

---

(١) لە (برایەتی) بڵاوکرایەوە

## ٥٦

نـــيـــــگـــەرانم تـــەزيـــوه
تەمـــی یاخـــیم تـــەـزیوه
هانیومـــە دەستی دۆستی
بلاوێنەوه کـــــۆســـــتی
داوێ له قـــژت ئەپسێنم
له دڵما ئــــەی ئـاڵـێنـــم

ڕواندز - ١٩٧٨/٨/١٦

# تاوسی کوردستان[١]

فڕۆکەخانەی چاوانی تینووم
دای لە شاباڵی فڕۆکەی تیژڕەو
لە ئۆقیانوسی هیندی هەگبەی ئارەزووی کردەوە
دارستانەکان لەسەر ئاوی زۆر
خەمی سەد ساڵەی دڵدارانی خۆر
بەقەد پرشنگی کچانی باڵق
بەقەد بڵێسەی دەروونی ئاشق
تاوسانی ناسک بەرگ ڕەنگاوڕەنگ
تۆزی غەریبی لە ڕووما سڕی
نیگاری نەمان لە دڵما دڕی
لە گەرمەی تاسە و دڵئارامی تەڕ
لە لاڵانەوەی دارستانی کەڕ
تاقە تاوسی خاکی کوردستان
تاوسی لەباری چەم و دارستان
لە تابلۆی ڕەشی بیرەوەریما
کێشای دیمەنی

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

ڕوخسار و بەژنی
کێشای تەماشای
پڕ سۆز و نیگای
بەشەرمەزاری تاوسی هیندی
سەری دانەواند
کە تاوسی کوردی چاوی هەڵهێنا
کە تاوسی کوردی چاوی هەڵهێنا

ڕواندز - ١٩٧٨/١٠/٢٦

# قاپیی خۆرهەڵات(١)

ئازیزەکەم
چاوەکانت تەڕ نەکردوون
بە بارانی دێوانە و شەم؟
لێوەکانت، کپ نەکردوون
بە داستانی دوو دڵداری
بەهرەی ئارام سەرنەگرتوو؟
گڵپەی گڵکۆ
گڕ بەر ئەدا لە گیانی من لە گیانی تۆ

❊ ❊ ❊

بەسەرهاتی ئێمەش گوڵم
ئاوی هەمان دەریای سیای خواردۆتەوە
هەمان بەفری لێک دابڕان
لەناو لەپیا توایتەوە
وا ئەناڵێ زۆر جار دڵم

❊ ❊ ❊

کەچی بزە هەردەم لێوم ئەگرێ

---

(١) لە هاوکاری بڵاوکرایەوە. هەستی دوو مەبەست

وره ئاسۆی دڵم ئەگرێ
ساویلکەکە نەکەی بڵێی
چۆن بۆت ئەکرێ
خوا نەت گرێ؟

* * *

من لە دەریای چاوەکانت
ئاوی تاڵ و سوێر ئەنۆشم
چۆلەکەم و بەم زستانە
بەهەناسەی ساردو سڕت
دێ فەرامۆشم
کۆرپەی حەزم
تا باڵ بگرێ
بە کوڵ ئەفڕێ
ئاسمان ئەبڕێ
تا لە قاپیی خۆرهەڵاتا
کۆڵ دانەنێ
ئۆقرە ناگرێ

ڕواندز - ١٩٧٩/١/٥

ئاوە ئەم دیو ئەوە دیوە گوڵە[١]
بۆ خەمەڵاندن گوڵدان دڵە
کوا خێرخوازێ بیچەسپێنێ
بۆچی ئاو هەر خولیای گڵە؟!

ڕواندز – ١٩٧٩/١/٢٢

دڵی هەژارم دڵی نازدارت[٢]
لانکی ئازاری خەم ڕائەژەنن
دایدڕە تارای شەرمی ئاشکارت
سەرمان سپی کرد با دڵ پێبکەنن

ڕواندز – ١٩٧٩/٢/١٦

(١) لە ڕۆژنامەی (بەهرە) بڵاوکرایەوە

(٢) لە ڕۆژنامەی (بەهرە) بڵاوکرایەوە

# تریفەی ڕەمەزان[١]

هەڵهات تریفەی مانگی ڕەمەزان
مانگی بەڕێز و پیرۆزی یەزدان
خەرمانە زەردە بۆ ڕۆژووگرتن
قورئان خوێندن و تەراویحکردن
درووود لێدان و ناوی خوا هێنان
کۆمەککردن و پەنای نەداران
پزیشکی بەرز بۆ تەندروستی
بۆ باوەڕداران فرە مەبەستی
هۆی گیرابوون و تۆبە و لێبووردن
ڕەزامەندی خوا و خەفەت گۆڕ کردن
لەم مانگە هەلە چەم میهر زۆرە
بێ بەشمان نەکەی خوایە لەم خۆرە
بێ بەهەشت هاتووین داڵ نێتە ڕێمان
توو خۆشەویستت ببوورە لێمان

ڕواندز - ١٩٧٩/١/٢٩

---

(١) لە هاوکاری بڵاوکرایەوە

# ئەی جیهانە سەربەرزەکەم[١]

بووی بە هەڵم
بەرەو ئاسمان کڕنۆشت برد؟
بووی بە باران
لێوی زەویت ماچ کرد؟
مەرجی تۆڵەت لە ناحەزی دڵ بردەوە؟
بووی بەمۆمی مرازخوازان
لە تاریکی کوژایتەوە!

❊ ❊ ❊

ئەی جیهانە سەر بەرزەکەم
قەت ڕەهێڵەی بەفر و باران
وشەکانتی نەسڕیەوە
قەت تەوژمی ڕەشی زریان
شاکۆساری تۆی نەتواندەوە

❊ ❊ ❊

تۆ ئەزانی ماسییەکانی دەریای دەروون
چاوی کاڵیان خوێنی تیا زا؟

---

(١) لە قەڵا بڵاوکرایەوە

تۆ ئەزانیٚ
بەهار هەگبەی نازی لێکنا و گەڵا وەرین؟
تۆ ئەزانی چاوانی یار ئاڵۆزن لێم؟

❋ ❋ ❋

دڵدارەکان
برژانگی چاو ئەکەن بە تیر
تاریی شەوگار ئەتۆرێنن
تا کازێوە بەیانی باش ئەکا

❋ ❋ ❋

ئەی جیهانە سەر بەرزەکەم
تا ئەمێنم دڵی لاتم
وەک گوارەی گوێی نازداران
لە جۆلانەی چاوەڕوانی
هەڵمەت ئەنیٚ
سروود ناڵیٚ
پیٚ ناکەنیٚ
پیٚ ناکەنیٚ

ڕواندز - ١٩٧٩/٣/٣٠

# کاروانکوژە[١]

کاروانکوژە
خۆ جەللاد نیی بەس بەناحەق
ون کە ڕێگەم، خوێنم بمژە
ئاخر ئەمرم
باڵەخانەت ئەبێ بەگۆڕ
وەک من دەڕزم
وات بەسەردێ
چۆن دڵت دێ
هۆ کەزی شۆڕ؟

❊ ❊ ❊

ئەگەر شەرمە
شەرم تارە
دادڕە تارا
کارەبایە؟
ئەوین وایە؟

❊ ❊ ❊

---

(١) لە برایەتی بڵاوکرایەوە

وەک بێ باوکان تاڵە سەبرم

باوانەکەم

یادم کەوە

ئاشتم کەوە

بیرتە دەتگوت: بێ تۆ دەمرم

ڕواندز - ١٩٧٩/٤/٣

ئەم ڕێگایە جێ ئەهێڵم[١]

لە کوێرە ڕێ خاک ئەکێڵم

کە ئەستێرەی چاوی هەڵدێ

لێڵە چاوم، شادی هەڵدێ

ڕواندز - ١٩٧٩/٤/٢٦

(١) لە ڕۆژنامەی (بەهرە) بڵاوکرایەوە

# بۆ مامۆستا «مەلا محەمەد ئەمین»[١]

خۆرەتاوی باوەڕم
ڕێبازی دنیای تەڕم
چەپکە گوڵی سەر مێزم
ئەی مامۆستای بەڕێزم
مەلا محەمەد ئەمین
ڕابەری بەرزی ئایین
ئەی مرۆڤی بەهرەمەند
ڕەفتار و گفتار پەسەند
سادە و ساکارو زانا
گەش و ڕووخۆش و دانا
شاڵاوی خەندەی لێوان
لادەبا تاریی کێوان
کاتێ لات دائەنیشم
شادم، بێ خەم، بێ ئێشم
بەهارمە، زستان، پایز
هاوین کوێستانمە... ئازیز

---

(١)لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

که وون دەبم جێت دێڵم
بۆ چڕنووکی زام وێڵم
ئەی دەستپێشکەری نێرگز
دڵگری گشت ڕواندز
خوا بتهێڵێ و دڵشاد بی
لەو دنیای تر ئازاد بی

ڕواندز - ١٩٧٩/١٠/١٦

چۆن دەشێوێ دەریای عیشقی وەک شەربەتت[٢]
گـرفـتـارم وەک خـاڵەکـەی سەر ڕوومـەتت

ڕواندز - ١٩٨٠/٨/٣

(٢) لە ڕۆژنامەی (بەهرە) بڵاوکرایەوە

# زگزاك[1]

بەرگدروو بۆ درڕوونی
پانتۆڵ، کراس
دمکی زگزاک دەجووڵێنێ
تا لە خەوشی هەڵوەشاندا
دوور بێ کار و بەرهەمەکەی

❊ ❊ ❊

ئۆتۆمبێل، لە ڕۆشتنا
دەیان لۆفە، بۆ پێشوازی دێنە ڕێگەی
تا لە نیزەی دار و بەرد و شاخ و ڕووبار
سەلامەت بێ و ئاسوودە بێ سەفەرەکەی؟

❊ ❊ ❊

(١) لە هاوکاری بڵاوکرایەوە

منیش ئەمڕۆ
لە بازاڕی (ڕواندز)دا گوزەر ئەکەم
ئەم لاو ئەولای شەقام ئەکەم
وەک زگزاک
وەکو زگزاک
نەبا گڕی، دەم و زاری، چەقەڵی شووم
بشێوێنێ، تاسەی چرۆی خەوبینینم
بە دێوجامە پڕ فێڵەکەی

ڕواندز – ١٩٨٠/٤/٨

# جەژنی چی؟[١]

جەژنی قوربانە بە ناو
زەنگی ناسۆرە تەواو
نە سەردانی خزمانە
نە خەندەی منداڵانە
دڵی ئینسان هەڵدڕین
لەجیاتی مەڕ سەربڕین
بزەی کازێوەی جەژنە
پەنا یەزدانی مەزنە
ئەم شـــــەڕە ئاوارەبێ
ئاشتی ئەم ئێوارە بێ

ڕواندز - ١٩٨٠/١٠/١٩

---

(١) أ- مەبەست شەڕی عێراق و ئێرانە
ب- لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

بۆیە حەز ئەکەم شەڕ ببڕێتەوە[١]
عێراق و ئێران یەک بگرێتەوە
تاکو تەیارە نێتە ئەم شارە
ئاخر ئەترسێ ئەم تاقە یارە

ڕواندز – ١٩٨٠/١٠/٢٨

## دیوانی کانی[٢]

دیوانی کانی یادی بە پێزمە
چون کانی دۆستی باوکی بەڕێزمە
زۆربەی شیعرەکان کۆرپەی سینەی بوون
وەک چەپکی لالە و حاجیلە و بەیبوون
نەیزانی کوڕی لە دوای مردنی
ماچ ئەکا شیعر و خاڵی گەردنی

ڕواندز – ١٩٨٠/١١/٣٠

---

(١) لە ڕۆژنامەی (بەهرە) بڵاوکرایەوە

(٢) لە ڕۆژنامەی (بەهرە) بڵاوکرایەوە

# بۆ پێغەمبەری مەزن محەممەد (د.خ)[1]

بۆ پایە بەرزی زرنگ
ڕابەی دینی گزنگ
بۆ باغی گوڵزاری تەڕ
خاوەن قورئانی بەفەڕ
بۆ باڵاترین ئینسان
تریفەی بیستی نیسان
بکەم کەمێ ستایش
دڵ ئارام و ئاسایش
بە گوزارشتی زۆر بەرز
بۆ پێغەمبەری سەر ئەرز
بەدەستی ترس و تاسە
خرپەی دڵ و هەناسە
ویستم بنووسم شیعر
شیعر شێوانی فکر
تا ئەمرم بڵێم هەڵبەست
ناگەم بە لووتکەی مەبەست
نـابینـا و نـازمـــــــانم
شتێ تەنیا ئەزانم
تاقــە کــەسـە لە ژیانم
پێشکەشی بکەم گیانم
پێشکەشی قەبر و خاکی
لاشەی بێگەرد و پاکی
پێشکەشی بەهرە و بیری
زانستی مەستی، ژیری
ئەدیســۆن و گـاگـارین
گشت بەرزانی ڕاپەڕین
بەکـازێوەی خـۆری ئەو
دەکــــەن داهێنانی نەو
ئەو لە مــانگ تـەرزتـرە
لە هــەتــاو بــەرزتــرە

❊ ❊ ❊

---

(١) لە ڕۆژنامەی (یەکگرتوو) بڵاوکرایەوە

ئەی پێغەمـبـەری دانا ئەی بلیـــمـــــەتی زانا
گوناهبار و ڕووڕەشین شەرمەزار و سەرکەشین
چاوی ژیـنـمـــان ئاڵۆزە ڕێبـازمـــان: تەمــە، تـۆزە
لە خــوا تکا بفــەرمــوو بۆ من، بۆ ئەو، بۆ هەموو
ســەهۆڵبــەندانمان بنوێ گـوڵـزاری دینمــان بڕوێ
لەو دنیـــــای تر ئازادبین لە خزمــەتت بێ داد بین
لە بارەگـــای بەرزی خوا هەنگ شیلەی گوڵان بخوا

ڕواندز - ١٩٨١/١/١

# چوار گوڵاڵە[1]

شیرین، شیرینە و ڕەیحانەی خۆش بێن
زاهیـــد زیرەکــــە و پەژارە بەزێن
فەرهاد، عـــاقڵ و شەوەزەنگ تەزێن
نارین، پەپوولە و ڕەوشت خەمڕەوێن
هەر چوار ئازیزن وەک بەستە و لاوک
ئارامی دایک و گـــــوڵاڵـەی باوک

ڕواندز - ١٩٨١/١١/١٧

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

# مەرگە هیوام[١]

چۆن پەرش و پەخشانە فیکرم

گیر نابێ بۆم مەلی شیعرم

هەر قۆناغێ کە بۆی ئەچم

لە نیـــوەڕێ مـــاتڵ ئەبم

قـــاوەی تاڵم دێنێـتـە یاد

کە بۆی هانیم گوڵی ناشاد

بۆ دڵـداریم نیـشـانە بوو

مەرگی شەم و دێوانە بوو

بەندی دڵی ســادە پچـــڕا

کە گوڵ وەری شیعر تۆرا

ڕەنگە ئیتر هەڵبەست نەڵێم

وەک چۆلەکـە لە داو هەڵێم

مـەرگـە هیـوام چاوەڕوانم

ئەبێ کـەی بێ؟ ئاخ نـازانم

ڕواندز - ١٩٨٢/٦/١٩

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

# نارین[١]

خونچەی دایە و بابەیە
خەندە و سەبر و تابەیە
سێ بەهارە تەمەنی
پەپوولەیە دیمەنی
فەرهاد، زاهید و شیرین
مەستن بە جوانی نارین

ڕواندز - ١٩٨٣/١/١

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

# کوردێکم ئەوێ، کوردێکم ناوێ(١)

کوردێکم ئەوێ، هۆگری کوردان بێ
ئازادیخواز و، شێری مەیدان بێ
زریان پەروەر و (شەی) کوردستان بێ
زیندان و مردن لە لا هەرزان بێ

❊ ❊ ❊

کوردێکم ناوێ بیری کورد نەکا
دڵی دڵداری چەم و هەرد نەکا
بۆ سەرفرازی گیان بەخت نەکا
دوژمن بەخەنجەر، لەتوپەت نەکا

❊ ❊ ❊

کوردێکم ئەوێ بێ لەنجە و نازبێ
خزمەتگوزار و بۆ میللەت سازبێ
نەزرێنێ پەیمان بە نیازی ڕازبێ
شەوگار بەزێن و شاهێن و بازبێ

❊ ❊ ❊

کوردێکم ناوێ پارە پەروەر بێ
باوەڕی بەرزی بەس زیو و زەڕبێ

---

(١) لە برایەتی بڵاوکرایەوە

لە ئێشی هەژار شەو بێ خەبەر بێ
قینی لە خاک و بۆ کورد کەدەربێ

* * *

کوردێکم ئەوێ، یەک ڕوو بێ یەک ڕوو
نەک من تاو و دوژمن ئەو تای تەرازوو!!
بۆ کورد بژی بەس زووتر بێ لە زوو
دژ بەمەینەت و ڕوو لە ئارەزوو

* * *

کوردێکم ناوێ، دیلی تانە بێ
ئامرازی دەست و پای بێگانە بێ
دڕکی خەبات و سای تەنگانەبێ
کورد نییە ئەبەد، کوردی وا نەبێ

ڕواندز - ١٩٨٣/٣/١٦

بریا خامۆش و ئاسوودە ئەژیام(٢)
ئەو خەونەم ئەدی ئەموت دڵنیام
دۆزەخە، مەرگە، ئەو بەرگەی تیام!!

ڕواندز -١٩٨٣/١/٢٤

(٢) لە ڕۆژنامەی (بەهرە) بڵاوکرایەوە

## نامەی نێرگز[١]

لەو ساوە ئەڵێی بتم
کاتێ کابرا پێی وتم
بەدوایی دەڕوا فڵان
دەژاکێ باغی گوڵان

* * *

تۆش تۆرا دڵت لێرە
تۆش هەوارگەت هەولێرە
تۆش سڕیت... نامەی نێرگز
جێ مەهێڵن ڕواندز؟!

ڕواندز - بەهاری ١٩٨٤

## بۆ باوکی خوا لێخۆشبووم عبدالقادر سلیمان[٢]

لە کۆچی دوایی بابە پەلەت کرد
ئەڵێی بۆ بەهەشت پەنای شادیت کرد
دەسا سێبەری یەزدان نۆشت بێ
لە هەڵەی ئێوە و هی ئێمەش خۆش بێ

هەولێر - ١٩٨٤/١١/٩

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

(٢) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

# هەندێ شیعری تاکی هاوژانر[١]

بەختیار نەبی — بەختیار نەبی

ساڵی ١٩٨٢

چانەبوو — چانەبوو

ساڵی ١٩٨٣

خاوەن خانم — خاوەن خانم

ساڵی ١٩٨٤

خۆڕا نییە — خۆڕا نییە

ساڵی ١٩٩٩

---

(١) لە ڕۆژنامەی (بەهرە) بڵاوکرایەوە

# نەورۆز[١]

نەورۆز نەورۆز، چرای بەسۆز
خونچەی یەخەی سەرپاکی هۆز
لاوی تەمەن سێ هەزار ساڵ
ئەی دروشمی زیندە بەچاڵ
پاســـەوانی بــووکی بەهــار
بزەی گوڵ و دڵدار و یار
تۆقــێنەری ڕەشـــەبا و هەش
چزووی مەرگی زستانی ڕەش
کــەوڵـی کـاوەت کـرد بە ئاڵا
لە مل زوحاک وەک مار ئاڵا
ناســـۆر باری پێـــچـــایەوە
شـادی ئاسۆی گـەشـایەوە
ســـازی ئاشـق وتی مـــــەلان
بچـــریکێنن بۆ چەند گــەلان
کە سەربەستن مەشخەڵ بەدەست
لە دوای کاوەن بەڕیز پەیوەست

---

(١) لە (هاوکاری) بڵاوکرایەوە

سەلماندی کورد مەردە، ئازا
دانامێنێ لە ڕووی قەزا
بۆیە نەورۆز لە توێی هەستا
وێردی کوردە تاکو ئێستا
وای تۆمار کرد مێژووی زێڕین
تا ئەجووڵێین پێی ئەنازین
چون چەم مەیلی لە شادییە
سەرمان لە ڕێی ئازادییە
بـژی نـەورۆز بەخـێـــر هـاتی
بـەنــدی ڕۆحـــی هــاووڵاتی

هەولێر - ١٩٨٦/٢/٨

# گوڵاڵەکەم(١)

دڵــم مــەستە، ســەرم گێژە
گیانم ژێر پێی سەرەولێژە
خــەندە خــەونی بینا تــارە
لە لێوانم.. ئای بێزارە
دێتە بەر گوێم دەنگێ لە دوور
تەڕ بوو دیدەی گوڵاڵەی سوور
بەژنـی تەنک، نـاسک، بـاریک
لێی ئاڵاوە، بیری تاریک
دروست دەکا هەورێکی ڕەش
بە جۆباری فرمێسکی گەش

❊ ❊ ❊

گوڵاڵەکەم تەزووی بەتین
بۆ دەسترازەی لانکی ئەوین
دای لە باڵی بلبلی هەست
دابهێنە ئەگریجەی خەست

❊ ❊ ❊

(١) هەستی دوو مەبەستە لە هاوکاری بڵاوکرایەوە بە نیوە چڵی.؟!

گـولاڵەکـەم، سـەرم گـێـژە
ڕۆژ ئەژمێرم زۆر لە مێژە
ژار لە دەست تۆ بۆ خۆمەوە
وەک شیری مەڕ بیخۆمەوە

* * *

گیان... گولاڵەی بەختی ڕەشم
ئاشنای شاخ و بەرد و کەشم
با ڕەشـــەبا بلــوورێـنـێ
لق و چـڵـت بـهـــەژێـنـێ
ناتشکـێنێ بـاڵات تــونـدە
لەسەر شیعری ناڵی بەندە

* * *

تۆم خـۆش ئەوێ لە خـۆم پتر
بۆ بەختیاریت ئەمرم ئیتر
چرۆت شــەرتە بـپـشکـوێ
لە مەزرای دڵ، ڕیشەی بڕوێ
ژیانەکـــەم، سـەرم گـێـژە
بەڵام بڕوام، دەست درێژە

هەولێر – ١٩٨٧/٦/٣٠

## زێد[١]

خـۆزگەم بەو کەسەی لە زێدا ئەژیٚ
لە ڕوویا عـەتری بەختیاری ئەپژیٚ
با نان و ئاو بیٚ، خواردن و خواردنەوەی
با دار و بەرد بیٚ، شوێن حەسانەوەی
کەم ناکا هەرگیز ئاستی ئاسایی
وەک ژینی غوربەت گشت بەخۆڕایی

هەولێر - ١٩٨٧/١٠/٢١

ژاڵە تاڵی ژیانمە[٢]
ژیانم ڕەگی گیانمە
گیانم یاری جوانمە
بیٚ جوان مەرگ میوانمە

هەولێر - ١٩٨٧/١١/١٩

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نویٚ) بڵاوکرایەوە

(٢) هەستی دوو مەبەست! لە ڕۆژنامەی (بەهرە) بڵاوکرایەوە

## پارە، یان ڕق و قین[١]

پۆشتە و پەرداغن، سەر لە ئێواران
دیدە تینوانی لای ئەسواق سیروان
هەر چاو خێڵ بوونە، هەر ئارەق ڕژتن
بۆ ناسکە کچ و لەنجەی شۆڕەژن
هەتاو دەخنکێ لە دووکەڵی ئاخ
ئاوات چاندنە بۆ لۆی گوڵە باخ
ئافرەت چ بەناز بەوێدا دەڕوا
وەک بەهرەی خۆی بێ، نەک دەستکردی خوا

* * *

ڕەنجەڕۆیەکی هەڵوەدای هەژار
بینی دیمەنی ڕێبوارانی شار
وتی لە سەیری کچە کورد حەقە
بەجوانی تاکن نەک قسەم ڕەقە
وەلێ گەوهەرێک خۆم خۆشم ئەویست
زۆر لە من پێشتر ئەو ئەمنی ئەویست
گەر هەموو جوانیەک کۆ بکرێتەوە

---

(١) لە برایەتی بڵاوکرایەوە

ئەستەم جێی پەنجەی ئەو بگرێتەوە
با ڕوا بێ لێی گیا لەسەر بنچ
نایگا بە ئاستی هەزار هەزار کچ

* * *

ئاخ لە جەزرەبەی چین و جیاوازی
بەسەر نەداران ئەنوێنێ نازی
دژ بەگەلێکی ئابڕوو لێ تکاو
کڕی بە پارە ئەشکی کلی چاو
وایە خەیاڵی پارەیە گشت شت
نەک گڕی ڕق و قینە کتومت
کاتێ کە هەڵچوو، دەست ئەوەشێنێ
بیناغەی تاسەی لێ ئەلەرزێنێ

هەولێر – ١٩٨٧/١٢/١٢

# بۆ شەهید[١]

هێشتا ئارەزووی دایکی بێ تووکی
نەبریسکایەوە بەدیدەی بووکی
هێشتا دەروونی باوکی پڕ لەوەی
نەیگرتە باوەش کوڕەزا و نەوەی
هێشتا نەیچێشتبوو چێژیماڵداری
نەیبینی کۆرپە و گریە و هاواری
هەر لەگەڵ دەنگی، زەنگی نیشتمان
تفەنگی یەکسەر کرد بەدەزگیران
لەگەڵ سەنگەرا دڵداریی ئەکرد
شێر ئاسا لە ژین دەستبەرداری کرد
ئەسرینی زولاڵ ئەیرژت لە خۆشیا
کە ئەیدی دوژمن لاشە و سەر جیا

❊ ❊ ❊

گوللەیەک سەر شێت پێکایە دڵی
جۆباری خوێنی لێ هەڵدەکوڵی
مەردانە خەندە لە لێوانی زەرد

---

(١) لە برایەتی بڵاوکرایەوە

ئەدرەوشایەوە وەک ڕۆژی بێ گەرد
ئەیگوت: ئا ئێستە شادی ئەناسم
شەهیدی خاکم کەی من کەساسم
ئێستە دەسازێ ئاوازی بیرم
کە گرتم ڕێگەی باو و باپیرم
من ڕۆییم ئیتر ڕۆحی ئێوە خۆش
بژی نیشتمان، بمرێ خۆفرۆش
کوڕگەل: میللەتێ ڕۆڵەی ئاوابێ
خۆری ئازادی بۆ لێی ئاوابێ

هەولێر - ١٩٨٦/٣/٢

# بۆ نزار و ڕۆژیده[١]

ڕۆژگارێ بوو چاوەڕێ بوو
کاکە نزار ڕۆژی لێدە
پێی بەخێر بوو لە ڕۆژی دە
ڕۆژی لێدە ست ڕۆژیدە
بژین بەجووت ژینی شادی
بە تەبایی و پڕ ئارامی
لەژێر سایەی دایک و باوک
خزم و کەس و مامیان سامی

هەولێر – ١٩٨٧/٧/١٠

---

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

# بۆ (شیرین)ی کچم[1]

نۆبەرەی بابە کچە گەورەکەم
ئاسمانی شین و پەڵە هەورەکەم
بەهاری بێڕۆ شیرینی شیرین
دەروون زوڵاڵت پاکتر لە ئەسرین
پەروەردەم کردی بیست ساڵی ڕەبەق
زوبان نەسووڕا بۆ یەک وتەی ڕەق
لەگەڵ هاوسەرتاش تەبایی و راس بە
وەکو دایکی خۆت ژنێکی خاس بە
گلۆڵەی ژینت تا سەد ساڵی تر
سەرەو لێژ نەبێ و هەر بژی ئیتر

هەولێر - ١٩٨٧/٧/٢٤

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

# یادگار[١]

مامۆستایان و ستتانی زانکۆ
شیرنن وەک شیعری حاجی شاری کۆ

❊ ❊ ❊

ئەوەی ئیبراهیم منی کوشتووە
پاکی تەمەنی بەفیرڕۆ چووە:
چۆن بۆ کراوە شەقڵاوە تەرک کە
وەک سۆفی بۆ جوان، مەنعی نەزەرکە

❊ ❊ ❊

مامۆستا حەمید هەر ئەڵێ ئۆخەی
لە دەست ئیدارە تەریو بووم بێ وەی
ئێستە ئاسوودەم وانەی خۆم دەڵێم
کوا دڵم دێڵێ لە زانکۆ هەڵێم

❊ ❊ ❊

مــامـــۆستا چنار بەژن وەک چنــار
کیژی ڕواندز معاونەی وشیار
لەخـــوا ئەخـــوازم بە باوکــی بیــار
دیدە ڕۆشن بێ و ژینی بەختیار

❊ ❊ ❊

---

(١) أ- پێشکەش بە سەرجەم مامۆستایانی قوتابخانەی زانکۆی سەرەتایی لە هەولێر
ب- لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

مـامـۆستا نـاسک، نـاسک و ئـاوەدان
بۆ مەکتەب ماندوو، بۆ ماڵێ کابان
لە شاری شیعر، کۆیەی مام حاجی
دنیای ناسیوە ڕۆڵەی باواجی

❊ ❊ ❊

دڵسـۆزی وانە شـیـلانی شـیـلان
چەند جوانە و لێی دێ چارۆگەی پیلان
وەک شەقڵاوەی خۆی ڕەند و ڕەنگینە
پێکەنین خۆش و ژیر و سەنگینە

❊ ❊ ❊

مامۆسـتا شلێر شانازی کـەرکـووک
هێمن و هێور، شێوەی تازە بووک
ئەپاڕێمـەوە لەو خـوایە بەخـوا
بەدەم کلیەوە ئیتر خەم نەخوا

❊ ❊ ❊

ست نسیبەش وەک مامۆستا شلێر
لەسەرخۆ و بێدەنگ بەرهەمی هەولێر
یاخوا ئەستێرەی بەختی ون نەبێ
مەلی مەینەتی قـەد لە کن نەبێ

❊ ❊ ❊

خوشکە ئیبتسام ئیبتسام شیرین
هاوسەری بەڕێز دارای دەست ڕەنگین

عاقڵ لەسەرخۆ بیر و هۆشی ورد
کچە هەولێری شاری کۆنی کورد

* * *

دەم پڕ پێکەنین خوشکە نازەنین
دەنکە هەناری باغی نازەنین
بۆ کــــۆرپەکــــانی چەند بە ئازارە
گریانیان لای ئەو کەمانجە و تارە

* * *

خۆشم دڵسۆزتان سامی ڕواندزی
شەوت بێ بێ ڕواندو گشت شادیم بەزی
خۆزگە هەموویان بەشارمان شادبین
لە سایەی ئاشتی دڵنیا بژین
پاشکۆی یادگار
شووشەی مەلیحیت مەلیحە نەشکێ
توورڕ دە توورڕەییت ئارامێ خوشکێ
یاخوا بەچکەکەت چاک چاک بێتەوە
گرمەی کۆخەکەت تێک بشکێتەوە
بمبەخشە کە تۆم لە یادا چووە
وابووە نوێژم لە بیر کردووە

هەولێر - ١٩٨٧/١٢/٢٠

# بۆ هەڵبەستی کوڕم[١]

هەڵبەستەکەم چاوەمەستەکەم
پاشە بەرە پەیوەستەکەم
کارە زرکە ژین کاڵەکەم
چراخانی ناو ماڵەکەم
تێر نابم لێت تۆی تەمەنم
ماچی گەرمت لێ ئەسەنم

هەولێر - ١٩٨٩/١/٢٧

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

# بۆ ئیبراهیمی جوانەمەرگ[١]

توورڕەم لە بەهار نایدوێنم هەرگیز
بۆچ بۆ ئیبراهیم گۆڕا بە پایز
ئەو ئیبراهیمەی خونچەی ساوابوو
هەر بە گوللەیەک ڕۆژی ئاوابوو
ئەو ئیبراهیمەی وەک هەڵۆ ئازا
تەمی  ئەبەزاند لە لووتکەی بەرزا
ئەو ئیبراهیمەی هێمن، لەسەرخۆ
دەستی یارمەتی ماندوو نەبوو خۆ
ئەو ئیبراهیمەی دەرناچێ لە دڵ
مەگەر بسازێ زەردەخەنە و گڵ
سا کاک ئیبراهیم بەهەشتی ئامین
کۆستی بۆ ئێمە بەختی بۆ زەمین

هەولێر - ١٩٨٩/٣/٢٨

---

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

# بۆ زاهیدی کوڕم[١]

خەمە ساواکەت نەشتەرە لە دڵ
مەردی خۆڕاگر زاهیدی عاقڵ
پەیامی ژیان هەر خوێندن نییە
هەوڵی بێ بەهرە خۆ مردن نییە
بڕیت سەربازی، کەرتی تایبەتی
ئەخاتە ئەستۆت دەستی یارمەتی
درەختی سەوزی ناسکتر لە گوڵ
ئەڕێژی عەتری بەسەرتا بە کوڵ
ئەشێ لەم ڕێگە بۆ داهاتووی نۆ
بە نیشتمان خزمەت بکەی تۆ
خەڵوەت نشینت دەرکە لە پەیڕەو
سۆزی هاوڕێی خۆش باشترە لەخەو
هەگبەی گوزەران بۆت ئەکرێتەوە
سستی و دڵ پەستیت دوور ئەخرێتەوە
چاوی باوکی خۆت زاهیدی زیرەک
ئارام بنێژە خەم دەرکە لە ڕەگ

هەولێر - خەزانی ١٩٩٠

---

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

# خوا[١]

لەخۆڕسکەوە شتێ هەست ئەکەم
چۆن هاتە ئارا ئەم ڕۆح و جەستەم:
ئەشکی ساوایم، بارانی پایز
نەبوایە دایکم نە ئەژیام هەرگیز
بەهرەی یەزدانە، بەزەیی دایکم
شەونخوونی زۆر، ڕاژاندنی لانکم
ئاژەڵ و بەچکەی ساکاری کەم هۆش
چۆن ئەگرێتە خۆی نازی جگەرگۆش
دوڕ و یاقووت و مەرجانی دەریا
بۆ ویستی خونچە ئەگا بەفریا
بڵێسەی دەروون دائەمرکێنێ
کەوی کورد ئاسا لە شاخ ئەنوێنێ
زەمینی بەرین پڕ پیت و پڕ پێز
بێشومار ڕووەک ئەدەن بەلەش هێز
ئامێزی ئاسمان پڕ ئەستێرەی زۆر
جیهانی جوان کرد نووری تیشکی خۆر

(١) لە گۆڤارێك بڵاوكرایەوە

بزەی پیرۆزی پەنجەی محەمەد
مانگی تابانی کردی بە دوو لەت
چۆن نەبێ باڵا بیر و باوەڕمان
سەوزی نەنوێنێ مەزرای بەفەڕمان
بۆ هەوەسیش هەس ئێژێ خوا نییە
خۆم ڕۆشنبیرم تۆ بەڵگەت چییە
کەسێ هۆشمەندە یەزدان بناسێ
با بێ سەواد بێ، ترسێ ناترسێ
تا هەتا نابێ تیشکی ڕووناکی
خۆراکی خۆشی شەوگاری خاکی
(یوم لاینفع) نەچێ لە یادمان
نە ماڵ نە منداڵ ناگەن بەدادمان
بیرمان لە ڕاستی بەڕاستی دوورە
ئەی خوای بانی سەر تۆ بمانبوورە

هەولێر – ١٩٩١/٨/١٨

# بۆ قەههار(١)

خۆی بە قەههار دا قەههار
لە قەهری ئێش و ئازار
قوڕ ئەپێوێ قەوم و قیل
دەست بە ئەژنۆ چەشنی دیل
بۆ قەههاری بەستەزمان
گۆڕا بەهار بە زسـتان
ئەوەی لە سێــتــاقــانـە
خــەمی بە سێ قـــاتانە
گەنج بوو، ڕوح سووک بوو قەههار
شێت بوو غەریب بوو نەک هار
کاتێ بۆ لامان ئەهات
قەهرمان ئەبو قات
بەقسەی حــەلەق و بەلەق
ئەهاتە کـــــوڵ دڵی ڕەق
حەیفە بۆ خونچەی وەریو
خۆرەتاوی لێ تەریو

هەولێر – ١٩٩٢/٤/٢٤

---

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

# برام... کێیە؟!(١)

بە کــەسێ ئەڵێم برام		شانەکا قژی مەرام
بە کــەسێ ئەڵێم برام		بۆم بێنێ بۆن و بەرام
بــرا ئــەبێ بــرا بــێ		لە تاریـکـی چـرا بـــێ
برووسکەی تەنگانەبێ		ببوورەی لەلا نەبــێ
بە کردەوە و ڕەفتار بێ		نەک بەزار و گفتار بێ
ئاخ زۆربەی خۆ پەرستن		لار و لاسار و پەستن
بە سـەرنجی سـتـەمکار		هەڵئــەمژن خوێنی هەژار
چەند جـۆر بەرگیان گۆڕیوە		سەدان قۆڵیان بڕیوە
حەرام، حەلال نازانن		هەر خەریکی گیرفانن
باسی کورد و کوردستان		نارنجۆکە بۆ مەستان
پارە کاتێ کەوتە ناو		ئەشێوێن ئیتر تەواو

(١) لە کوردستانی نوێ بڵاوکرایەوە

نییە خێریان بۆ وڵات      ببن بە قوربانی لات
هەژارە بەس، مەردانە      ئامادەی ئەم مەیدانە
دەروون پرشنگی هەتاو      لە زاری ئەپژێ: سەرچاو
جەرگی شەوەزەنگ ئەدڕێ      ڕۆندکی داماو ئەسڕێ
خـاک و خـۆڵ چاوی لێیە      مژدەی ئازادیی پێیە
چۆن کورد زۆربەی هەژارە      ئەڕوا حەتمەن پەژارە
چـونــکە بــۆ دراو دژین      ئەستەمە ژێردەست بژین
شادبێ کـورد شاد بێ هەژار      بۆ بەدکار... کۆت و ئازار

هەولێر – ١٩٩٢/١٠/٨

# سەد دینار[١]

دەستی لەرزۆکی کەوتە
چنگاڵی تووڕەی پۆلیس
مووچڕکی تاڵیی پێدا
وشەی ژەهراوی: دەست پیس

❊ ❊ ❊

دڵـۆپـی ئـابـڕووی تـکـا
کـتــێـبـی کــاتێ دزی
باڵی شەرمــینی کـــوتا
وەک مـــار بۆ لانە خزی

❊ ❊ ❊

ســپی هەڵگەڕا ڕەنگی
خنـکا لەدووکـــەڵی ئاخ:
(بـا بـڕووخێ هەژاری
لێی سەنیم هۆش و دەماغ)

❊ ❊ ❊

---

(١) لە (برایەتی) بڵاوکرایەوە

لەتەک خەندە خاوەن ماڵ
گـوتی کاکە: مامـۆستا
هاوڕێی گـیانی گیانیمە
شەیدای شنەی سوحبەتە

* * *

فەرموو کاکە سەد دینار
بـۆ بژێـویت بەرەوە
سەد دیناریش گشت مانگێ
بێرە و بیرم کەرەوە

* * *

کـاشکی پاک دەوڵەمەندێ
ئاوایان پـەیڕەو ئەکــرد
بە دێوجـامـەی سەربەرزی
کاسەیان بۆ لێو ئەبرد

هەولێر – ١٩٩٣/٦/٥

# یادی زیرەک[١]

بیست و شەشی شەش دوو هەزار و چوارە
یادگارێکی تاڵە و مەرگی ناودارە
جیهانی هونەری هێنایە گریان
بلبلی تاقـــانەی باغی موکریان
چریکەی سۆزداری حەسەن زیرەک ڕۆی
هەتیو بوو هونەرمان وەک هەتیویی خۆی
ئەوانەی لە دوای ئەو ئەڵێن گۆرانی
کەڵک وەربگرن لە مەزراو خەرمانی
لە نێو گوڵاندا بڵند و سەرچڵ بن
هەمیشە بەهار و ئاکامی دڵ بن
شەپۆڵی بۆنیان دنیا بهەژێنێ
نامەی لووتکە بۆ وڵاتەکەم بێنێ

هەولێر - ١٩٩٤/٦/٢٦

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

# چۆن بگرم ئارام؟[١]

چۆن بگرم ئارام خەفەت نەچێنم
لە شارەزوورا سەراب نەبێنم؟
چۆن چرا هەڵکەم کوانی جیهانی؟
چۆن نەی بژەنم چی بێ حەیرانی؟
بۆچی هەر نوێژ و ڕۆژووم کرد تەواو
داخرا دەروازەی دەروونی دۆڕاو؟
ئاخر بە لەنجە و سیمای بیانی
جەوان بی یا پیر بۆچی ئەڕوانی؟
درۆ، جنێودان، جار جارەش کفر
وەکو زار و مار دێیتە سەر سفر
پاش ملە قسە، گاڵتەو دووزمانی
هەوارگەی حەزتە ئەچی بۆ بانی
جیاوازیی ئاشکار نێوان کچ و کوڕ
سەر لەئاسمان کوڕ کچیش بۆ ناو قوڕ
دراوسێت، خزمت، نانوێ لەبرسان
تۆش لەبەر قاسەت نانووی لەترسان

---

(١) لە گۆڤارێك بڵاوكرایەوە

هەرچیت داناوە خەوتووە بۆ خۆی
نەحەج، نەزەکات، نەتێریش ئەخۆی
لەناو خێزانتا ڕووگرژ و دڵڕەق
سەرپێچیەک کرا ئەیدەیە بەر شەق
هێشتاش گەرەکتەو ئەخوازی بەهەشت
وەک دڵارامان بسازێی بۆ گەشت
پاشگەز بەرەوە لە ناهەمواری
ئاتاجی دەستی پەروەردگاری
خوایە سەرکەشین دوورە ڕێگامان
توو کتێبی خۆت ببوورە لێمان

هەولێر – ١٩٩٤/٨/١٦

# جگەرگۆشەتان لە یاد مەکەن[١]

دوو وشە بیکەن بە ئەڵقەی گوێتان
دایکان، هۆ باوکان دەستم دامێنتان
بێچووی ناسکتان بەڕەڵڵا مەکەن
سپاردەی چەقۆی دەست بەڵا مەکەن
دڵی پاکیزەی جگەر گۆشەتان
ژەنگ هەڵنەهێنێ بە سازی نەزان
ڕابەری یەکەم دایک و باوکە بەس
ڕۆشنکەرەوەی ڕێبازی مەبەس
ڕۆڵەت شەقامی ژیانی ئەوێ
قەڵای قەشەنگ و سەیرانی ئەوێ
ئارەزوومـــــــەندە ببێ بە مرۆڤ
زانا و توانا، دوور لە ئاخ و ئۆف
ئارام بەخشانە ئامۆژگاری کە
لە تەمی ڕۆژگار تۆ ڕزگاری کە
هەر سەر ئێشانێک بێژێ یا بیکا

---

(١) لە گۆڤارێك بڵاوكرایەوە

هۆکاری یەکەم بۆ دایک و باوکە
هەر کازێوەیەک ئەنجامی ئەدا
ئەڕوێ نەمامی بەزەیی خودا

* * *

چۆن چۆنی بەچکە تۆ ئەکەی بەخێو؟!
تف کە لە ڕووی ئەم، بەم بدە جنێو!
کوڕت هان ئەدەی لێیدە لەخوشکی
یان تەنگ هەڵچنێ بە برای بچووکی
سەرکۆت، پێخاوس لە کووچە و کۆڵان
لە جۆگە و سیان ئەکەن قوڕ شێلان
دەست و دەموچاو بەژن و بەرگ و لەش
هیلاک و ماندووی چڵک و خم و هەش
کچی نەوبەهار بەژن بە قەد نەی
پێی ئەڵێی بۆ کوێ؟ ئەچی شوو ئەکەی؟
دەم بە مەمە کوڕ پێی ئەفەرمووی کەی
ژنت بۆ بێنم حەز لە کێ ئەکەی؟!
بۆچ دائەنیشی شەو لە پێش دەرگا
کام دەست بە فریای سکاڵات ئەگا؟
خۆت ڕائەکێشی لەناو تۆز و خۆڵ
لەگەڵ دراوسێت بە قسەی فش و فۆڵ

لادە لە چەوتی بگرە هێــڵی ڕاست
بلەرێنەوە ئاڵای حەز و خواست
بنێ هەنگاوی کۆمەڵ بەرەوپێش
بڕژێنە شادی شوێن خەفەت و ئێش

هەولێر – ١٩٩٥/٦/٨

## زیرەك و ماملێ[١]

زیرەک یا ماملێ کە ئەچڕن بەستە
بۆ شانازی کورد ئەوەندە بەستە
ئەوانەی ئیمڕۆ ئەڵێن گۆرانی
سادەن، بێ بەهرەن، لێی پەشێمانی

١٤-١٩٩٦/٤/٢١

(١) لە ڕۆژنامەی (بەهرە) بڵاوکرایەوە

# پەیامی ژیان[١]

پەیامی ژیان شانە هەنگوینە
ڕێبازی حــەز و پۆپەی ئەوینە
بزاڤە گیان، بەری ڕەنجدانە
حــەز و ئارەزوو، بزەی ویژدانە
بەرزی و نشێوە، تارمایی و تەمە
فرمێسکی زۆر و پێکەنین کەمە
زانایە کەسێ بەسەریا زاڵ بێ
گرژی ڕۆژانەی زیندەبەچاڵ بێ
تەمەن نووحت بێ ئەبێ تۆ بڕۆی
سێبەرت نەبێ، سادەی ڕەنجەڕۆی
ئێرە و ئاوا گەر، ئەولاتر ئاگر
عەقڵ وەرە سا کوا دەورت ئاخر؟

* * *

پەیامی ژیان ساکارە ئاسان
لەم بەردەبازە نەبی هەراسان
لاو چاک بە، گوڵ بە، تۆ بەختیاری

(١) لە گۆڤارێك بڵاوكرایەوە

خاوی لێو بە بار، ئەگەر بەدکاری
مەدویّ پاش ملە، درۆ مەکە قەت
ڕەوشت نایاب بە داوێن پاک بە مەرد
چاو تێر بە سەنگین، هەتیو پەروەر بە
بۆ کۆمەک کردن، ڕادە بەدەر بە
بەنیازی ئاڵۆز بۆ جوان نەڕوانی
نادروستە لێت سەیر و سەیرانی
قومار و یانە سەرگەردانییە
ئەنجام خواردنەوە پەشیمانییە
ژماردت چەند جار یەک، دوو، سێ چوار پووڵ
لە دنیای بێ دەر بکە یادی قووڵ
بگێڕە چاوێ زەندی لات بگرە
فرمێسکی سوێری برسییان بسڕە
گەر بەهەشت خوازی ناخی دڵ پاکە
تووڕدە لاساری سەلماندن چاکە
بەشکو لە باغی بەهەشتا شادبی
لە دەستەویەخەی ئاگر ئازادبی

هەولێر - ١٩٩٦/٥/١٤

گوڵی جوانی و گەنجیم هەڵوەری[١]
بەهاری تەمەن هات و تێپەڕی
ناڵە و ئازاری پیری هاتە پێش
خۆراکی خاکە لەشی پڕ ئەندێش!

هەولێر - ١٩٩٧/٤/٢٢

(١) لە ڕۆژنامەی (بەهرە) بڵاوکرایەوە

# ڕۆژی هەینی[١]

ویستم بگرم مەلی شیعرم بەهار هێشتا ساوا بوو
تێی تەقاند زوو، بەرز فڕی وەک خۆری گەش ئاوابوو
لە کام دەربەند لەنگەر بگرم، هەیامێکە نازانم
شکا باڵم، گوتم نازی هۆزان نووسین ناتوانم
شیعر ژانە، جێی ئەهێڵم، دڕک و داڵی هەورازە
هەرزەکار بووم، مەرگی باوک، هێنایە ڕووم ئەم ڕازە

❊ ❊ ❊

کەچی ئاخ خەم، گرتی یەخەم، پیربوو بەهار ڕوو لە زار
کاتێ وتی: بمرە بۆ خۆت مەرگی دایکە نەک گوڵزار
لە دوو هەزار سێ ساڵی کەم بەروار بیست و سێی گوڵان
دوای نوێژی ڕۆژی هەینی، دوو کوڕ و چوار کچ گریان
وەک برووسکە، مەلی شیعر، بۆ خانەی دڵ هاتەوە:
بڵێ شیعر، مەبە ماتڵ، نابێ خەم بتباتەوە

(١) لە (برایەتی) بڵاوکرایەوە

بۆیـە گریـام، ئەسـرینم ڕشـت، بـۆ پـەروەردەی بادینـان
بـۆ ئافرەتێـک گشـت (ڕوانـدز) ناویـان ئەبـرد (نەعیـم) خـان
بـو ئافرەتێـک سـەربەرز و مەنـد، وتـە شـیرین، هەمەڕەنـگ
دەم بەخەنـدە، بەپێکەنیـن، بـەڵام تـۆزێ قیچکـەی تەنـگ
سی و هەشت ساڵ لەدوای باوک، پاکی ئێمەی گرتە باوەش
ژەنگـی ژیـان زوڵمـی زەمـان، نەژاکێنـێ گوڵـی گـەش

* * *

وەک خـۆی ویسـتی پـڕ ئـارەزوو، کڕنۆشـبەری یەزدانیـن
لـە گوڵـزاری بەهەشـتا بـێ، بەقوربانـی قورئانیـن
کەوتە هەولێر خاکی گڵکو، نە (ڕوانـدز) بـوو نـە (دهـۆک)
یـەزدان نەبـێ کـێ ئەزانـێ لـەکام ناخـا ئـەدەی چـۆک
ڕۆژی هەینـی، یادگارێکـە، یـادی وا تـاڵ هـەر نییـە
تـا ئەمێنـم گشـت ڕۆژێکـم هەمیشـە هـەر هەینـییـە

هەولێر - ١٩٩٧/٥/٣٠

# جگەرە(1)

ئۆخەی لەدەست جگەرە
وا ڕزگارم بوو ئۆخەی
ئاوارە بوو ئازار و
تەنگەنەفەسی و کۆخەی

* * *

لە شیعرێکی پێشووما
بەنایابم ناســـیـیـە
نایابی چی دوژمنە
وەک ئێسقانی ماسییە

هەولێر - ١٩٩٣

# شیعری پێشووم

کێ ئەڵێ جگەرە خەرابە
شتێکی چاک و نایابە
دژ بە دووکەڵی جگەرە
ئەم دووکەڵی جگەرە
لەجیاتی ئاخ هەڵکێشان
خۆشترە جگەرەکێشان

هەولێر - ١٩٨٩/٢/٤

---

(١) لە گۆڤاری (مەلا مەشهوور) بڵاوکرایەوە

# کۆچی ئازیز[١]

بەیانە و لێڵە، خەیاڵە یا خەو
چپایە گوێچکەم، خەبەری خوسرەو
خەزانی کوردە، کۆچی ئازیزە
باڵداری شادی، فڕیوە، زیزە
لەجیاتی جفات بەزمی زمزیران
ناڵەی دەروونە لە سای زنجیران
منداڵی سادەش لە شاری قازی
شەمزاوە حەزیان ناچن بۆ وازی
بلبلی سەر مەست دڵنەواز بەکورد
(محەمەد ماملێ) ماڵئاوایی کرد

❊ ❊ ❊

هەتیـو بـوو هـونـەر ئـەڕوا ئارامی
کێ بگرێ دەستی شەقامی کامی
خەجیلە و خانم، شاڵی کرمانی
ئیندر قاشییە، دەشتی لاجانی
حەوسەد گۆرانی قەتار و بەستە

(١) لە (برایەتی) بڵاوکرایەوە

سەریان لێکداوە لەتوێی یەک رستە
مەگەر خوسرەو و عەزیز و چالاک
شوێن پەنجەی ئەو بن بچڕن سۆزی چاک
سا با موکریان، رانیـــــە قـــــــەڵادز
قامشلی و بۆتان، کۆیە و رواندز
بابەگوڕگوڕو، زاخۆ و سلێمانی
بگەزن پەنجەی سوو و پەشێمانی
هونەرمەند هەتا لەم خـاکـە نـەمـرێ
بەمانای وشە کەس ڕێزی ناگرێ

هەولێر – ١٩٩٩/١/٢٥

# بیری نامۆ[١]

چرای یەزدانە قـــورئان
چاوی جیـهـانە قـورئان
کۆستی ئینسانە قورئان

❊ ❊ ❊

بێ قورئان کوێرە ئینسان
رێوار هەڵدێرە ئیـنسان
بێ خێر و بێرە ئینسان

❊ ❊ ❊

با هیماڵای ئەرز بێ
دەسەڵاتی بەرز بێ
زانستی گشت تەرز بێ

❊ ❊ ❊

کە خولیای سازی نەو بێ
(بیری نامۆ)ی پەیڕەوبێ
بەهای هەناسە و خەو بێ

❊ ❊ ❊

---

(١) لە ڕۆژنامەی (یەکگرتوو) بڵاوکرایەوە

بەقورئان پەیوەست نەبێ
لە باخی سەر مەست نەبێ
ڕامی گیری هەست نەبێ

❊ ❊ ❊

دەزرێ سنووری ڕاگـــــر
ئەپۆشێ بەرگی ئاگــر
ڕیزبەندی هێـڵی گاور

❊ ❊ ❊

(بیری نامۆ)ی دفن بەرز
بەسەر لاتا نازی فەرز
تاقـە باڵـە خاوەن قەرز

❊ ❊ ❊

گەر بکرێ لە زێڕ پەیکەر
بۆ ناوزەدی بە سەروەر
(زام نە دەرئەبێ و.. نە زەر)

هەولێر - ١٩٩٩/٧/٢٤

# ئاهی خاك[١]

هەرزەکار بووم تازە ساڵ
دەنگی زوڵاڵی شەماڵ
بزواندی ناخی هەستم
مەلۆتکەی خستە دەستم:
بخەملێنە نیشتمان
نەوای بێ پەروای گشتمان
دەنازێ بەسەر دۆستان
نرکەی خرپەی کوردستان
هەتوانێ بۆ زامی دڵ
نەبا بێ پەیامی گڵ

❊ ❊ ❊

لەو ساوە چی خەباتە
کام دەربەند هۆی نەجاتە
هەرچی ئارەق ڕشتنە
مایەی خەفەت کوشتنە
بێنە سوێندت بۆ بخۆم
لە ڕێی کوردستانی خۆم

---

(١) لە (برایەتی) بڵاوکرایەوە

ئەنجامم داوە چالاک
نەمسووتێنێ ئاهی خاک
ڕەت بوو تەمەن لە پەنجا
تێر بەختیار نەبووم ئینجا!
کەی وەک گەلانی جیهان
ئەلوێ بۆم سەیرو سەیران؟
کەی سامانم دێتە بەر
ڕۆشن کا چاو نیلوفەر؟
خۆزگەی تاسەی ئەفریقیام
کوا سنوور و جوگرافیام؟
کوا بەیداخی نیشتمان؟
کوا بایەخی پەرلەمان؟
کوا سەفیرو حکومەت؟
کوا سۆزی گێتی و میللەت؟

❊ ❊ ❊

بگرن (بەڕێزان) ڕێزمان
پشتمانە مێژوو و زمان
با ساز بێ سەوزی نیسان
ئەگینا کوا مافی ئینسان؟!!

هەولێر ١٩٩٩/١١/١٧

# هەندەران[1]

هەندەران کارەساتە
دەروون کۆنترۆڵ.. زاتە
سەفەر دژوار و سەخت
ئاخ و ئۆخەی هاووەخت
دەست بەئەستۆی بەپەلە
ڕەخساوە، جەژنە، هەلە!!
دەترازێ مڵک و ماڵی
پشت بە بەخت و ئیقباڵی:
(لەسەر چڵم هەڤاڵان
منم ڕووگەی چاوکاڵان
مۆتەکەی ئاژاوە و پووڵ
نادوێنێ چاوێری قووڵ)
پڕ قنیات و حەزی دڵ

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

بڵقی ئاوە مەرگ و گڵ
ناحەز پلانە یۆنان
بۆ ماسی ئەبێ بە نان
یاخود سنووورداش ئەکرێ
ماتڵ بۆ پارەی کرێ
(کل چەمە خاکی وڵات
قیرڕوسیا لەکارەسات)

هەولێر – ٢٠٠١/٥/٩

## هەندەران و مەندەران[١]

هەندەران و مەندەران
کۆڕگێڕی قەلەندەران
دەفرۆشێ خانوو مانی
بۆ ژنی خانومـــــانی
ڕێگەی هات و نەهاتی
قوربانی و قڕی و قاتی
دەگرێ و دەڕوا بەپەلە
بۆی ڕەخساوە ئەم هەلە
بای بای ئەکا لە خەڵکی
لە دایە و بابە و پلکی
لەگەڵ قاچاغچی ڕێکەوت
بەرگە ناگرێ هەشت و حەوت

(١) لە گۆڤاری (مەلا مەشهوور) بڵاوکرایەوە

پڕ بەحەز و تاسەی دڵ
بڵقی ئاوە مەرگ و گڵ
هێندی نـابـا لە یۆنان
بۆ ماسی ئەبێ بە نان
یاخود سنووورداش ئەکرێ
دەمری بۆ پارەی کرێ
بگەڕێتەوە وڵات
قیرۆسیا لەکارەسات

هەولێر - ٢٠٠١/٥/٩

# بۆ فەرهادی کوڕم[1]

شایانی دیوانی شیعری
زەنوێری هەست و هزری
زیت و زیرەک و زانا
فەرهادی سادەو سانا
ژیان ئەرکــی دەلەرزێ
بەهرەت کــە دادەبەزێ
بە تاسەی بزەی سەرلێــو
دەترازێ تەمی سەرکێــو
دەچڕن ئاوازی بەســۆز
مـێـرگی گوڵانی نەورۆز

❊ ❊ ❊

من جەمێک لەژیانی خۆم
لەیادم چـوو نان بخــۆم
بۆ تۆ شیعر کە نەمگوت
لەم شێـوەیە کـتــومت
ئەی ئیـقبـاڵی دوو باڵم
چراخــانی ناو مــاڵم

هەولێر- ٢٠٠٢/٣/١٥ - ١ی موحەڕەمی ١٤٢٣

---

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

# بۆ (کامەران)ی جوانەمەرگ[1]

بە ماچی جەبین جەوانی
بە گڕ گۆڕا چرۆی هەتوانی
شەیدای خۆڵ بووی خۆت مەڵاس دا بۆی
پێت ناساندین هەور و بارانی
داخە دیدە بۆ گەردوونی دوون
دەرکە لە دڵ هەتا ئەتوانی
مناڵ بووی بابە دوور کەوتەوە
میوانی ئێستە دەست لە ملانی
بۆیە لە بەهار من تۆراوم
خنکا (کامەران) کامەرانی

هەولێر - ٢٠٠٣/٤/٦

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاو کرایەوە

# بۆ مەرگی کاکە ئیحسان[١]

کۆستێکی ترمان کەوت هەمیسان
لە سێ گوڵاڵەکانی نیسان
چڵێکی گەشمان لێ بوو نوقسان
خەندەی سەر لێو تۆرا و هەراسان
خودا ببەخشی لە کاکە ئیحسان

❊ ❊ ❊

چەند خۆشبوو کاتێ گشت ئێوارە
لە گازینۆی باخی ئەم شارە
چاو بە چاویلکەو دەست بەدارە
بە تاسەی نوکتەی بێ ژمارە
یان بە تووڕەبوونی جار جارە
ئەیبزواند دەروونی ئاوارە

❊ ❊ ❊

هاوین ڕۆیی و خەزانی خەم هات
شێوا شادی و شالاوی تەم هات
ڕۆندک مشتە و ئارامی کەم هات

---

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاو کرایەوە

نالّەی نامۆ لە زیل و بەم هات
نائومێدیی دێوانە و شەم هات
شەکر تاڵ بوو مەرگی ماتەم هات

هەولێر – ٢٠٠٣/٩/٤

## بۆ گڵکۆی کاك ئیحسان[1]

پڕبێ گۆڕەکەت لە مێرگی گوڵان
شانە کە قژی مەرامی دڵان
پەنجەت نەگەزی بۆ شانۆی ژیان
پێکەنینی کەم بە لێشاو گریان
ڕواندز و شاخ دیمەنی نیسان
خەندەت بۆ بێنی برالە ئیحسان

هەولێر – ٢٠٠٣/٩/٢٠

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

## پیرۆزبایی[١]

لەدایکبوونی تۆ پیرۆزی ئەوێ
سەمەنی نەباتی نەورۆزی ئەوێ
بووژاندمتەوە وەک سەوزە گیای بەهار
چۆن ئەچێ لە یاد گەورەترین یادگار؟!
قۆناغی ژینت پڕ بووە لە لۆمە
بۆ ژنێکی هۆشمەند بڵێی: هی خۆمە

هەولێر – ٢٠٠٣/١٠/١٥

## بۆ ئوسامەی جوانەمەرگ[٢]

ئەڵێی بۆ خەم خوڵقابوو
خەندەی لە جابلۆقا بوو
مەرگیش زادەی سامە
بەدبەختە کاک ئوسامە
ئەنۆشێ خەندەی شادان
لە قیامەت پشت بە یەزدان

هەولێر – ٢٠٠٣/١١/٢٧

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

(٢) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

# نازی ژیان

١- جیهان جوانە، ژیان ژانە

٢- مامۆستایانی ئایینی هەر چەند بەساڵادا بچن، هێندە جوانتر و دڵگیرتر خۆیان ئەنوێنن، هەتا لای (مەیخۆری مەستیش).

٣- ئەنجامدانی گوناهـ و تاوان، لەباوەڕ لاوازییە.

٤- لە پرسەدا.. پیری سواڵکەر شان ئەدا لە شانی رابەری کۆمەڵگا، چۆن هەر گەنجەو بە ئومێد و ئاواتی قۆڵ گرتن و ڕەخساندنی جێگەی گونجاو و ئارامە بۆی.. نازانم ئاخۆ لەماڵەوە چۆن چونی گفتار و ڕەفتار ئەنوێنن لەگەڵ دایک و باوکیانا؟!.

٥- پرسەیە و قورئان خوێن، قورئان ئەخوێنێ. هەر ساتێ وەستا بەمەبەستی فاتیحا خوێندن، لەپڕ کەسێ هەڵئەسێ دەس ئەخاتە ژێر گوێچکەی و قورئان ئەخوێنێ.. یانی چی؟!

٦- بانگدەری ڕەسمی کاری خۆی ئەنجام ئەداو ناکاو کاورا لێی بە پەلە بەرەو میکرۆفۆنەکە ڕائەکا: (بە یارمەتی خۆت من خۆم حەز ئەکەم بانگ بخوێنم).. بۆ؟!!

٧- ڕایەخی مزگەوت بە ئاستەم لار بووەتەوە، هەر پیرەمێردەو خۆی بەرزی ئەکاتەوە تا ئاسایی کاتەوە...؟!.. خێرە

٨- کەسێ وا هەیە، یارمەتی هەژار ئەدا، زکر ئەکا، وەلێ وەک دەڵێن بە (دەنگو دۆڵ)...!! دەوروبەر ئاگادار بێ پێوە.

٩- گەنجەو عەبای بووزی ئەخاتە بان شانی و سیمای ئایین

پـەروەری بـەدی ئەکـرێ لێـوە..!!
١٠- خەمـەکان لاوەکین بەپێ و ڕێژەی خەفەتی سـەرەکی: (قەبرو حەشر).
١١- چاکەکەمـە، گریمـان مننەیـە، بـەڵام (دەنگخۆشـی) دەگمـەن و ریزپـەڕە هەروەهـا (چـاوی جوان)یـش.
١٢- ئـاواز و گۆرانیـی کوردیـی سـەردەم لـە (باڵاخانەیـە) و لـە (ئاوێلکە)دایـە...!!!
١٣- شیعری ئازاد بەڵگەی بنبڕبوونیەتی. (خۆ خۆرە).
١٤- شاعیران لە چوار ئەدگارا هاوتان:
أ- بەبێ باوکی هەراشی بوون
ب- بەکەم دەرامەتی و گوزەران
ج- ناکامن لە خۆشەویستی
د- تەمەن کورتی
١٥- چوار حاڵەت وەک ئەفسوون وایە:
أ- شیعر نووسین
ب- ئاواز سازکردن
ج- هەستی ئەندامی حیزبی بۆ پێشەواکەی
د- ئەڤینی بێ گەردی نێوان (کوڕ و کچ).
١٦- ڕاپەڕینە شکۆدارەکەی بەهاری (١٩٩١) قوتابخانەیەکی کارامە بـوو لـە کوردسـتان بـۆ سـەرجەم چیـن و توێـژەکان، نەخاسـمە لاوەکان. کـە مـن پێـم وایـە مێژوومـان زیرەکـی و چەڵەنگیـی وای

نەبینیـوە.. باوەکـو لـە زانیـاری و زانسـتی خوێنـدگا لـە ئاسـتی ڕۆژگاری بووریـدا دابەزیـون!!!

١٧- لـە (٢٤) بیسـت و چـوار کاتژمێـری شـەو و ڕۆژا تەنیـا نانـی بەیانیـان لـە کاتژمێـر (٨-١٢) کـەش و هـەوا و ژیانـی نـاو مـاڵ ناسـاز و هەراسـانە، وێـڕای سـەرقاڵبوونی کابـان بـە پاککردنـەوە و ڕێکخسـتن و چێشـت لێنانـەوە.

١٨- تەبایی پتـەو نێوان ئەندامانـی بنەماڵـە بـە ئامادەبوونـی میـوان پێـک نایـە..!!

١٩- کەسانێ هەیە:

أ- لە دەرەوەی ماڵەوە شەکرن، لە ناوەوەی ماڵەوەش ژەهرن.

ب- ئامـۆژگاری ئەکـەن، خۆیـان پەیـڕەو ناکـەن!!! (جگـەرە تـەرک کـە).

ج- تێرە و ئێژی برسیمە (برسییە و بێژی تێرم)

٢٠- پووڵدار پلە دارە، نەدار بێگارە!!!

٢١- گەنجی گەنجینەیە، پیری فەقیرییە.

٢٢- تا کۆچی دوایی نەکەین، باڵا نابین!!

**هەولێر**

**٢٠٠٣/١/٢٤**

# جوان[١]

ئای کە جوانێکی زۆرزانم دی
هێرشی بۆ دڵ هێناو لەگەڵ خۆی بردی
عەقڵ توورە و ڕۆیشت بیهێنێتەوە
کەچی ئەویش چوو و هەر نەمدیتەوە
چاو گوناهکارە ئەم هەڵەی بە من کرد
بۆچ من نازانم نامکا بە شەقام و پرد
دڵ کارەساتە گەنجەو قەت پیر نابێ
پیری و مەینەتی ڕاگیری پیر نابێ
جوان: شۆڕشە و فیتنە پیرو لاوە
دەگمەنە، ڕیزپەڕە، کەم بەخشراوە
ئەڕوا و ئەلەنگێ چاو هەڵناهێنێ
ئاشنای دڵانەو هەورەو ئەگرمێنێ
جورئەت و ئارام لە ئارابێ باشە
لەم باخ و گوڵزارە بکەی تەماشە
وایە خەیاڵی تا ئاخیر هەناسە
جوانی هاودەمەو هەر بۆ خۆی خاسە

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

دیم دوێنێ جوانی جاران ئەڵماسی
سەرنجی ڕانەکێشام خۆی منی ناسی
بەژنی پایزی، ڕوخساری لۆچ و چورچ
بەفر داپۆشیبوو شەپۆلی ڕەشی پرچ
دەمرد بۆ باوەشی ساردی خاک و خۆڵ
کە ڕائەبووردن شۆخانی شادو شەنگۆڵ
تۆش پەککەوتە ئەبی ڕوو گرژو قرژن
جوانان بەعیشوە ئەڵێن پێت: پیرەژن
خۆم خاوەن جوان بووم پەسەند بدەی دڵ
خەزان خزانی بۆ چاڵی تاری گڵ

هەولێر - ٢٠٠٥/١٢/٣

# مژدەی سەروەری(١)

بۆم یەکناگرن پێڵووی چاوانم
قەترە تەڕ ناکا ئێشی شەوانم
شەوی یەڵدایە و بەیان هەڵنایە
خاک چەپکێ نێرگزی لە قژ ئاڵایە
لە بەهەشت ئەکا ئەم لالە زارە
ڕۆحی خاتوو زین لێی شەرمەزارە
ئاسۆ ڕوزامی هەیامی بووری
هەتوان هاو دەمەو هیوا سێبووری
سازی سەرکەوتن دەچڕێ و دەنازێ
دێ لە دەروونا سەدان ئاوازێ
کورد دەسەڵاتی باڵا و بەتینە
پەنجەی گەیشتە پەلکەزێڕینە
دامرکایەوە بورکانی مەراق
کوردە سەرۆکی کۆماری عێراق

---

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بەکەمێك دەسکاری بڵاوکرایەوە

مژدەی سەروەری مام جەلال هانی
ئاوێتەی تاسەی مەسعود بارزانی:
پۆستی کۆماری خستوومە ئەستۆ
پەیڕەوی حەزی دڵی من و تۆ
ڕۆحی شەهیدان شاد و شەنگۆڵ بێ
وڵات سەیران و گڵکۆیان گوڵ بێ
کوردستان ئارام ئاڵای شەکاوە
ناحەز نابینا دڵی شکاوە

هەولێر ٢٠٠٥/٤/٦

# تاقانەی بانق[١]

کەم ئەدوێ، کەم پێئەکەنێ
خەتەرناکە ڕیشەی دڵان هەڵناکەنێ
ئاوڕ ناداتەوە، چاوان هەڵناهێنێ
خەزان ڕائەبێ ژێرەو دەڵێ ناهێنێ
گەردەلوولە، سڕە سایەتە
عیشوەکاریی ناشێوێنێ شادە
تاقانەی ئەم بانقە
قردێلەی شین ئەئاڵێنێ لە قژی زەرد
زەرووره لەپکەشینە بۆ چاو و زارو دەرد
لە کەیهانی ئەستێراندا مانگەشەوە و ئاشکار
ناز پەروەرە، سەرفرارە، نەک منەتبار
سەنەمە، پەیکەرە، بێهەست
ڕووچرِو بێباکە دڵ، بێهوودە زنجیر
ئەخاتە دەست
شتێک هەیە بڵێم پێت با بیزانی
بۆیە نەشمیلەی، قەشەنگی، جوانی
سوپاس بژێربە: پەروەردەی کوردستانی

هەولێر- ٢٠٠٦/١/١٠ یەکەمین ڕۆژی جەژنی قوربان

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

**شیعری یاسایی منداڵان**

# بژی یاسا

**نووسینی: سامی ڕواندزی**

# من قوتابی دڵپاکم(١)

من قوتابی دڵپاکم زیت و زیندوو و چالاکم
سروودی ئاشتی دەڵێم بۆ حکوومەتی هەرێم

❊ ❊ ❊

مامۆستام خۆشەویستە دەروازەی پێداویستە
پاک قوتابیان برامن چرا و بۆن و بەرامن

❊ ❊ ❊

ئەرکەکانم ڕێک ئەخەم ئەبن بە خونچەی یەخەم
بەهێزی مێشکی زانین خاک ئەهێنمە پێکەنین

❊ ❊ ❊

کـەلـوپـەلی هـەڤــاڵان ئەیپارێزم لە تاڵان
غائب نابم لە مەکتەب دائەنیشم بە ئەدەب

١٩٧٥/٣/١ – ئێران- ڕەبەت

---

(١) أ- بەرواری ١٩٧٥/٣/١ لە ڕەبەتی ئێران دامناوە
ب- لە بەرواری ٢٠٠٠/١٠/١٩ دەستکاریم کردووە
ج- لە خەزانی دوو هەزار و یەك (٢٠٠١) لە گۆڤاری (هەرێم) بڵاوکرایەوە

# قوتابی پۆلی شەشم(١)

قوتابی پۆلی شەشم
درکی ڕۆژگاری ڕەشم
لە ئێستەوە بەڵێن بێ
بۆ وڵاتم پێشکەشم

❊ ❊ ❊

وڵات خاکی زێڕینە
لە بەرهەما زەنگینە
بێ ناز کاتێ ئەیبینم
دەروونم ماتەمینە

❊ ❊ ❊

(١) أ- لە گۆڤاری (پەلکەزێڕینە) بڵاوکرایەوە
ب- ئەم شیعرە بۆ فەرهادی کوڕم نووسیوە، کە ئەوسا پۆلی شەشەمی سەرەتایی بوو، لە قوتابخانەکەی خۆی خوێندیەوە.

ماموٚستایان بەڕێزن

بەهرەمەندو بەپێزن

پشتیوانمن قوتابیان

بوٚ بیری پاکم هێزن

❊ ❊ ❊

بڕیار ئەدەم تا نەمان

دەست خەمە ئەستوٚی ژیان

بڵێم بژی ماموٚستا

بژی کورد و کوردستان

هەولێر – ١٩٨٤/١٢/١٨

# نەورۆز[١]

نەورۆز، نەورۆز، نەورۆز گیان
جوانی وەک مانگی ئاسمان

❊ ❊ ❊

مانگ دەورەی ئەستێرەی زۆر
تۆش گوڵزار و تیشکی خۆر

❊ ❊ ❊

باغەوانی بەهاری
سروشت ئاسا ڕووباری

❊ ❊ ❊

بزەی گوڵ و سەیرانی
بۆ بەرخودان شایانی

❊ ❊ ❊

بەخێر بێی نەورۆزەکەم
گوڵی یەخەی هۆزەکەم

هەولێر - ١٩٨٨/١/٢٥

---

(١) لە گۆڤاری (هەرێم) بڵاوکرایەوە

# سالاری لاسار(١)

منالّینه وەرنه پێشێ

گیانتان یاخوا قەت نەیێشێ

گوێ ڕاگرن بۆ ئەم چیرۆکە

شیرنتر لە شەکرۆکە!

کــوڕێ هەبوو ناو سالار

توند و تیژ، هار و لاسار

ئامۆژگاری دایک و باوکی

تیراوە بوو لە توێی مێشکی

ئۆتومـــبـــیلێ دەرکـــەتایە

ئەبوو خۆی لێ گـیـرکـردایە

چی شوفێری گەڕەک هەیە

هەراسان بوو لەم ئەبڵەیە

* * *

تا ڕۆژێکیان بەیانی زوو

لەگەڵ هۆڕن لە ماڵ دەرچوو

پیکابێ بوو باری قورس

---

(١) لە (هاوکاری) بڵاوکرایەوە

له گیانی خۆی تەواو وەڕس
یەخەی گرت و شاد و خەندان
مڵکی خۆی بوو پاکی جیهان
پیکاب کاتێ کەوتە لێژی
بڕیی ڕێگا زۆر بە تیژی
ترسا سالار خۆی تێهەڵدا
لە ئاکاما قاچی شکا
سا خۆت بگرە نەخۆشخانە
سالار حاڵی پەرێشانە
یەک مانگی ڕێک تیا مایەوە
تاکــو دەرچوو برژایەوە
بۆ لێبووردن بە چالاکی
پەنای برد بۆ دایک و باوکی
وتی: شەرتبێ تا ئەمێنم
بۆ فەرمانتان دانەمێنم
بڕیاری دا تا لە ژیان بێ
کــارێ نەکــا هۆی زیان بێ

هەولێر - ١٩٨٩/٧/١٩

# باران[1]

بەندی دڵان هۆ باران
بۆچ ناباری وەک جاران؟
بۆچ نەبانی لە یاران؟
بۆچ نەنازن نەداران؟

❊ ❊ ❊

چاوەڕێتە زەوی و زار
لابەری ئێش و ئازار
لەپایز دەرچێ بەهار
ئامێزی پڕ لە گوڵزار

❊ ❊ ❊

مرۆڤ سەراپا شاد بێ
لە وشکەساڵ ئازاد بێ
مەرگی مەلی کەساد بێ
وەرزی بزەی مراد بێ

هەولێر - ١٩٩٩/٤/١

---

(١) لە گۆڤاری (هێلانەی منداڵان) بڵاوکرایەوە

# پەپوولە[١]

پەپوولەی کوردستانم
ڕازاوەی لەنجە جوانم
ڕەنگ سەوز و سوور و زەردم
ئاوێنەی کێو و هەردم
شەیدای گوڵ و گوڵزارم
شـنـەی نەورۆز و بەهارم
لە هەڵبەز و دابەزم
زوو... زوو پێت دەڵێم ئەزم
ئەکەم سەما جاروبار
لەگەڵ ئاوازی رووبار
تاسەی سەیرانکەرانم
وەک مانگ بۆیان ئەڕوانم

---

(١) لە گۆڤاری (هەرێم) بڵاوکرایەوە

ئارەقـــم بـۆ ئەڕێژن
بەدواما وێڵ و گێژن
دێمە سەر لەپی دەستت
بەڵام توو چاوی مەستت
نەمکەی بەقوربانی حەز
بڕەنجێنی دڵی ڕەز
نەمشێلی، نەمشێوێنی
هەناسەم نەتۆرێنی

هەولێر - ٢٠٠٠/٣/١٧

# کۆتایی هاوین[١]

هاوین وا ئەبڕێتەوە
خوێندنگا ئەکرێتەوە
تۆز و گەرما و گەردەلوول
کۆتایی دێ لە ئەیلوول
هەوا سازگار و خامۆش
سەر ئاسوودە و فەرامۆش
قوتابی بۆی ئەگونجێ
لەخوێندنەوە نەڕەنجێ
منیش ئەخوێنم بڕیار
سەرکەوتوو بم وەکو پار
وڵاتم ئـــاوەدان بـــێ
نەتەوەم شادومان بێ

هەولێر – ٢٠٠١/٨/٢٢

(١) لە گۆڤاری (هەرێم) بڵاوکرایەوە

# تاقیمانەی سەری ساڵ[١]

تاقیمانەی سەری ساڵە
نەختێ سەختە.. قەدی زاڵە
گـۆڕەپانی تێکۆشـــانە
قژی زیرەک ئەکا شانە
سەرچڵ ئەبێ لەناو گوڵان
ئەخزێتە ناخ باخی دڵان
(قەدی زاڵە) ڕووی ئەگۆڕێ
رەواق جیلوەی لێ ئەچۆڕێ
بێرە مەیدان قوتابیی ژیر
ئەتۆ بازی ئەزموون نێچیر!
بژێنەوە وڵات لە نۆ
کێ شک ئەبەین جگە لە تۆ!
نەکەی تەوقی نادروستی
بخاتە پات کۆتی پەستی
بنیشێ لێت ڕەنگی مردوو
حەسرەتبار بی بۆ ڕابردوو
مەیخە پشتگوێ هەل زێڕینە
کۆشش سازی پێکەنینە

هەولێر – ٢٠٠٢/٤/١١

---

(١) لە گۆڤاری (پەلکە زێڕینە) بڵاوکرایەوە

# مانگی ڕەمەزان[١]

مانگی ڕەمەزانە
بە سەختی مەزانە
ساکار و ئاسانە
سوودمەندی ئینسانە
ئاسۆ موسڵمانە
سی ڕۆژ برسیمانە
تاعەت و قورئانە
پابەندی فەرمانە
تاوان داخزانە
عەترو گوڵبارانە

❊ ❊ ❊

---

(١) لە گۆڤاری (جگەر گۆشەکان) بڵاوکرایەوە

دێتە کوڵ جەژنانە
گۆشت و چێشت و نانە
نوقڵ و پووڵ و ئانە
شادان و سەردانە
دیلانێ و سەیرانە
خەندەی سەرلێوانە
خەم وێڵی کێوانە
دەسازێ خەرمانە
گوڵمان بۆ تەرخانە

هەولێر - ٢٠٠٢/٧/١٠

# براو برادەر[١]

من و کاکە ڕابەرین
براین و برادەرین
تەبایی مەبەستمانە
ماڵ گوڵی نیسانمانە
ناهێڵین دەستی ناپاک
هاوجووتیمان بکا تاک
کاکە بۆم پەرێشانە
قژەکەم ئەکا شانە
چاوی لێمە هەمیشە
دانەمێنم لە کێشە
لە خوێندنگا و یاریگا
بۆ ناو باغ و سەیرانگا
هەردەم پێکەوە ئەڕۆین

---

(١) لە گۆڤاری (هەنگ) بڵاوکرایەوە

بڕێشکە و ساردی ئەخۆین
دایە و بابەش ئاسوودەن
ڕووخۆش و دەم بەخەندەن
بە ئێمەوە سەر بەرزن
لە هەورازا نابەزن
پشت و پەنا تا پیری
باڵایە ئاڵای ژیری

هەولێر – ٢٠٠٣/١٠/٥

# ئەزمونی سەریساڵ[١]

هەڵبەست گوتی: کاک حەمرین
پەیام بۆ خامە بەرین
دوێنێ مامۆستا فەرهاد
بەخەندە و دەروونی شاد
فەرمووی: ڕۆڵەی قوتابی
بێ بەرهەم ئارام نابی
ئەزموونی سەری ساڵە
نازی بەسەرتان زاڵە
بکێشن نازی بەگیان
بڕازێتەوە ژیان
سازبن بۆ ئەرک و فەرمان
هەوڵ و کۆشش بە خەرمان
هەلە و مەیدە بە فیرۆ
بۆ کووچە و کۆڵان مەڕۆ
خامەی پڕ لە زانیاری

---

(١) لە گۆڤاری (پەلکە زێڕینە) بڵاوکرایەوە

دابرِێژی مرواری
سەرکەوتوو سەر بڵندە
گەشە ئاسۆی ئایندە
لە کۆمەڵدا دیارن
دایە و باب بەختیارن
خاک ئومێدی پێیانە
چاو لە ڕێگەی پێیانە

هەولێر - ٢٠٠٤/٣/٩

## دایە و بابە[١]

دایە و بابە هیلاکن
گورج و گۆڵ و چالاکن
ئەبەخشن کامەرانی
ئامادەن بۆ قوربانی
سەربازی بەرخودانن
نازی منداڵ دەزانن
وەک کارەبا بۆ ژیان
دادەگیرسێن بێ وچان
ڕێبازی ڕاست و ڕەوان
دوور لە مۆتەکەی شەوان
وەک مەدالیا بۆ کۆرپە
سەلامەت بێ لە کۆسپە

---

(١) لە گۆڤاری (هەنگ) بڵاوکرایەوە

ئەرکی سەرشانی ئێمەش
نەژاکێنن گوڵی گەش
لە فەرمانیان هەمیشە
بەڵێ: بکەین بە پیشە
مخابن ئاوی خاوێن
لێڵ بێ بە فرمێسک و خوێن

هەولێر - ٢٠٠٤/٥/٣٠

# دراوسێ(١)

دراوسێ ئارام بەخشە

دەنگ ئەبیسم لە حەوشە

سێبوورە بۆ گشت ماڵێ

پەژارە ڕائەماڵێ

لە پێویستا یەکەم کەس

دروا‌سێیە بۆ مەبەست

لە ساردی و گەرمی ڕۆژگار

بەشدار ئەبێ و بەختیار

منداڵیان با ئازیز بن

نەک لێمان بوغزوزیزبن

ناو ماڵیان بە حورمەت بێ

لە فتبۆڵ سەلامەت بێ

---

(١) لە گۆڤاری (پەلکەزێڕینە) بڵاوکرایەوە

دایک و باوکیان خۆشەویست
توند و تۆڵ بین بۆ پێویست
کەس بۆی ناکرێ جودایی
هەڵکا لە چۆڵ و چیایی
داوای عەقڵ هەمیشە
چاکەی کردووە بە پیشە
ئەوەی لە خوا بترسێ
بگرێ ڕێزی دراوسێ

هەولێر – ٢٠٠٤/٦/٨

# هەڤاڵی بەدکار[١]

هەڤاڵی بەدکار مەگرە
دەروونی گشتی مەگرە
ناهەموارە و دڵی ڕەش
وێڵە بە دوای فێڵ و غەش
بۆ بەرژەوەند تۆی ئەوێ
سوودێک بەشکو هەڵکەوێ
قازانج نەبوو یان نەما
دیواری دۆستیی ڕما
هەڵوێستی خاس نانوێنێ
حەز ناکا کەس بخوێنێ
بە برای چاوی هەڵنایە
شەهادەی لا بەڵایە
پەلکەزێڕینەی بەرزە

(١) لە گۆڤاری (پەلکەزێڕینە) بڵاوکرایەوە

ڕۆحی دێنێتە لەرزە
تۆی بێگەرد و ساوێلکە
دیمەن جوان و چۆلەکە
ئی وا مەکە بە هاوڕێ
ناوت نەبادا بزڕێ
زانست و ڕەوشتی چاک
هەڵتەکێنێ لێت ناپاک

هەولێر - ٢٠٠٤/٦/١٤

# نەنکم[١]

سێبووری ماڵ نەنکمە
ڕێز گرتنی ئەرکمە
دنیا دیتەو لێزانە
ژیر و سادە و ئاسانە
بیری پڕ لە چیرۆکە
شیرینتر لە شەکرۆکە
وەک یاقووت و مرواری
زاری بۆ ئامۆژگاری
بابەی بەناز پەروەری
دایەی کردە هاوسەری
مایەی خەندەو تابەیە[٢]
خۆشەویستی بابەیە
ئەبەخشێ کاری بچووک

---

(١) لە گۆڤاری (هەنگ) بڵاوکرایەوە

(٢) تابە: توانا

وەک هاوکاری بۆ بووک
دایەش حورمەتی ئەگرێ
نایەڵێ خەم دایگرێ
بۆ چەسپاندنی تەبا
بە (دایە) ناوی ئەبا
ژین نیسان و بەهارە
ماف و فەرمان دیارە

هەولێر ٢٠٠٤/٩/٧

# پشیلەی کوێر[١]

ئەم پشیلە بۆ کوێرە؟
لە ڕۆشنایی زوێرە؟
بەردی منداڵ بە ئەنقەست
چاوێکی دابێ لە دەست؟!
پشەی ناو ماڵ و کەوی
ئاشنای سۆزو بەزەیی
بەنازی میاو میاو
ئەدوێنێ بەچە و پیاو
بە بزواندنی زنجیر
دەسازێ بەزمی زمزیر
مشکی پۆخڵ ئەلەرزێ
بە بینینی ئەبەزێ
ئارەقەی شەرمت نەتکا
ئەم نەشمیلانەت پێکا
بەختیاریت دێتە جۆش
چاوێکت گەر کوێر بێ تۆش؟

هەولێر – ٢٠٠٤/١٢/٩

(١) لە گۆڤاری (پەلکەزێڕینە) بڵاوکرایەوە

# مێروولە[١]

مێروولەی عەقڵ بچووک
ئێسکی نییە و ئێسک سووک
گورج و گۆڵ و چالاکە
بە ئومێدی خۆراکە
تۆز و خۆڵ و ڕەشەبا
دانەوێڵەی کە ئەیبا
ماتڵ نابێ نابەزێ
بۆ گشت پەناو پێچ ئەخزێ
تا دابین نەکا جەمی
دانامرکێتەوە خەمی
بەشەو ئەحەسێتەوە
چاوەڕێ ڕۆژ بێتەوە

❊ ❊ ❊

(١) لە گۆڤاری (هەنگ) بڵاوکرایەوە

ئەی قوتابی ڕووناکبیر
عەقڵت گەورە و زاناو ژیر
دەرکە سستی لە ڕیشە
بخوێنە تۆ هەمیشە
بە کۆشش باڵا ئەبی
شانازی ئاڵا ئەبی
بۆت دەسازێ گوڵباران
دایک و باوک و کامەران

هەولێر - ٢٠٠٤/١٢/١٢

# باخی گشتی[١]

بڕوانە باغی گشتی
باغی گەل وردو درشتی
باغی خونچە و لالەزار
سنۆبەر و ئیسپیندار
سەوز ڕازاوە خاکی
لە تەم و تۆز بێباکی
هەوا بێخاڵی ئاسا
جار جارە ئەکا لاسا
باغەوان ئەیرِشێنێ
لق و پۆپ ئەهەژێنێ
جۆللانە و چەرخ و فەلەک
چالاکی بەخشە گەلەک
بۆ شایستەی شارەکەم
دیمەنی گوڵزارەکەم
نەمامی مەقرتێنە
چیمەنی مەشێوێنە
بپارێزە خاوێنی
سەربڵند بێ هاوینی

هەولێر - ٢٠٠٥/٤/٢٨

---

(١) لە گۆڤاری (هەنگ) بڵاوکرایەوە

# مەلەوانی[١]

مەلەوانی وەرزشە
تەوژم و تیم بەخششە
لە ئیسلامدا سوننەتە
نەختێ هەوڵ و هیممەتە
دڵان شادمان ئەکا
خەمان پەرێشان ئەکا
هەڵبەزو دابەزینە
خرۆش و پێکەنینە
شەڕە ئاو و وازییە
گشت لە یەکتر ڕازییە
مەلەوان جۆش ئەسێنن
مەلانیش ئەجریوێنن
نەیزانی مەلەوانی
ئەچێژێ پەشیمانی
پردی نەبوو ڕووبارێ
مەلە بوو تاقە چارێ
ئاشنا نەبووی وا ڕێکەوت
دائەنیشی و پەکت کەوت

هەولێر - ٢٠٠٥/٥/٢

---

(١) لە گۆڤاری (پەلکەزێڕینە) بڵاوکرایەوە

# یاسا[١]

بەرهەم ڕەنگینی یاسا
پەلکە زێڕینە ئاسا
داد پەروەریی بڕیارت
پاک یەکسانیی ڕەفتارت
ماف و فەرمان بەرامبەر
ژینی سەربەست دەستەبەر
ڕادەماڵی تەم ڕۆژگار
چاو هەڵنایە شەرمەزار
بزەی سەروەری و باڵا
متمانە ئەکا ئاڵا
قوتابخانە و خوێندنی
بەرنامەی ئەفراندنی
بە یاسا دەکرێتەوە
نەهامەت دەبڕێتەوە
نەوەدو شەش جار بە ئینسان
قورئان زانستی ناسان
خوێندکاری کوردی ئێمەش
ئەگات بە ئەستێرەی گەش
وەک جیهانی پلە یەک
هێزی مێشک و هەست لە تەک

هەولێر - ٢٠٠٥/٥/٥

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

# هاوسێم[١]

هاوسێم ناوی شیلانە
هۆشمەندو نەشمیلانە
ئاخافتنی شیرینە
دەمی بە پێکەنینە
شۆڕیجە گەرەکمانە
کوردستان گەڕەکمانە
هەمیشە تێئەکۆشین
ئەنجام خوێندن بنۆشین
شەیدای ژینی پێشکەوتووین
هەموو ساڵێ سەرکەوتووین
بەجووتە ئەکەین وازی
تاکو دڵمان بخوازی

---

(١) لە گۆڤاری منالآنی (باوە گوڕ گوڕ) بڵاوکرایەوە

بەعزیش ئەبین بەعزێ جار[٢]
زیرەكانە ئەیكەین چار
جۆڵانەكەی ناو حەوشە
فرە چالاكی بەخشە
پاڵ بە یەكتری ئەنێین
سروودی ئاشتی ئەڵێین
بژی مامۆستای بیر ورد
بژی كوردستان و كورد

هەولێر - ٢٠٠٥/٥/٢٤

---

(٢) بەعز: دیشك، زیز

# سەرما(١)

ئیمڕۆ زۆرم سەرمایە
بەفرو باران و بایە
زستانێکە فرە تووش
نابینرێ یەک زل و پووش
هەستە درەنگە دایکە
جلی گەرمم لەبەرکە
نەء... نەء بۆ خۆم ئەزانم
لەبەرکەم جلەکانم
بلووزو سەدریەکەم
قاپووتیان لەسەر ئەکەم
گۆری و پووتی زنجیرم
چەتری حەجی باپیرم
بۆ خوێندنگا ڕێکەوم
لەگەڵ زستان ڕێککەوم
ناهێڵم سەرماو سۆڵە
لە ڕقی هاوین وەک تۆڵە

---

(١) لە گۆڤاری (هەنگ) بڵاوکرایەوە

له ناو نوین و ئازار
کۆخه و پەسیو و پەژار
کەپسوولەو دەرزی و دەرمان
منەت بکەن بەسەرمان
بێ بەش بم له خوێندنا
زانست و سەرکەوتنا
زانست و تەندروستی
هیوات ئەخاتە دەستی

هەولێر - ٢٠٠٥/٩/٢٠

# مامۆستا[١]

مامۆستا سەروەرە
وەک باوکم ڕابەرە
شایانی سوپاسە
تا ئاخیر هەناسە
خوازیارە ئایندەم
سەیران بێ بە خەندەم
بخوێنم هەمیشە
نەبینم ئەندێشە
جەستەم چاک، دڵم پاک
شایستەی خۆڵ و خاک
گرفت و دڕک و داڵ
تۆڕی تەم یادی تاڵ
بە زانست ڕایماڵم

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

خۆر هەڵبێ لەماڵم
وڵاتم پڕشنگدار
دوژمنم بێقەرار
بۆ ڕووی مانگ هەوڵدەم
پێشەنگ بم بۆ سەردەم
گشت جیهان بناسم
شەیدابن بۆ باسم

هەولێر – ٢٠٠٥/١١/١١

# بژی یاسا[١]

بابە شتێکم فێرکە
بۆماڵ بێت یاخود فێرگە
لە ژیانا شارەزابم
ژیر و زیت و ئازابم
ئەندامێک بم بە کەڵک
خۆشەویست بم لای خەڵک
ڕۆڵە یاسا بناسە
ئاشنای بە پڕ بە تاسە
پەیڕەوی ڕێبازی بە
مل کەچ و سەربازی بە
ماڵ و مەکتەب و جادە
ڕازاوە بێ و ئامادە
دەسی یاسا بیگاتێ
مژدەی شادی بیداتێ
منداڵان ئاسوودەبن
لە کۆمەڵدا خۆشنوود بن

---

(١) لە گۆڤاری (پەلکەزێرینە) بڵاوکرایەوە

دایەو بابەو خوشک و براش

تەبا و نەوبەهاری باش

وڵات بەرزی بنوێنێ

ناحەز چاو هەڵنەهێنێ

سا بژی یاسا سەروەر

بژی خامەی داهێنەر

هەولێر - ٢٠٠٦/١/١٩

# یاسای ناوماڵ[١]

لە فێرگە گەڕانەوە
ماڵە بۆ حەسانەوە
نان و چێشت و خۆشوشتن
وانە نووسین و خوێندن
لەوێ دەستەبەر ئەبێ
ژیانت مەیسەر ئەبێ
ماڵیش یاسای پێویستە
ڕێزدار و خۆشەویستە
دایە و بابە ڕابەرن
تاجە گوڵینەی سەرن
دڵیان قەت نەڕەنجێنن
فەرمانیان بەجێ بێنن
بچووکمان نرخدار بێ
کارێ نەکەین بێزار بێ
دەستی باپیرە بگرین
بۆ ڕێی مزگەوتی بەرین

(١) لە ڕۆژنامەی (بەدرخان- نێرگزی منداڵان) بڵاوکرایەوە

میوانمان بەخێر بێنین
لەخۆوە پێ نەکەنین
ژوورەکان گشت خاوێنبن
هۆی ئارامی و هەوێن بن
کەل و پەلی نەشکێنین
باغ و گوڵ نەشێوێنین
ماڵە تەبا بێ پڕ خەندە
یاسا سەری بڵندە

هەولێر - ٢١ /٢٠٠٦/١

# یاسای دایك و باوك

دایە و بابە هیلاکن
گورج و گۆڵ و چالاکن
ئەبەخشن کامەرانی
ئامادەن بۆ قوربانی
سەربازی بەرخودانن
نازی منداڵ دەزانن
وەک کارەبا بۆ ژیان
دادەگیرسێن بێ وچان
ڕێبازی ڕاست و ڕەوان
دوور لە مۆتەکەی شەوان
وەک مەدالیا بۆ کۆرپە
سەلامەت بێ لە کۆسپە
یاسای سەرشانی ئێمەش
نەژاکێنین گوڵی گەش
لە فەرمانیان هەمیشە
بەڵێ بکەین بە پیشە
مخابن ئاوی خاوێن
لێڵ بێ بە فرمێسک و خوێن

# یاسای براو برادەر

من و کاکە ڕابەرین
براین و برادەرین
تەبایی مەبەستمانە
ماڵ گوڵی نیسانمانە
ناهێڵین دەستی ناپاک
هاوجووتیمان بکات تاک
کاکە بۆم پەرێشانە
قژەکەم ئەکا شانە
چاوی لێمە هەمیشە
دانەمێنم لە کێشە
لە خوێندنا هاوکارمە
لابەری شەوی تارمە
بۆ خوێندنگاو یاریگا
بۆ ناوباغ و سەیرانگا
هەردەم پێکەوە ئەڕۆین
برێشکە و ساردی ئەخۆین
دایەو بابەش ئاسوودەن
ڕووخۆش و دەم بە خەندەن
بە ئێمەوە سەربەرزن
لە هەورازا نابەزن
یاسا پەروەر تا پیری
باڵایە ئاڵای ژیری

# یاسای باغی گشتی

بڕوانە باغی گشتی
باغی گەل وردو درشتی
باغی خونچەو لالەزار
سنۆبەر و ئەسپیندار
سەوز و ڕازاوە خاکی
لە تەم و تۆز بێ باکی
هەوا بێخاڵی ئاسا
جار جارە ئەکا لاسا
باغەوان ئەیڕشێنێ
لق و پۆپ ئەهەژێنێ
جۆللانەو چەرخ و فەلەک
چالاکی بەخشە گەلەک
بۆ شایستەی شارەکەم
دیمەنی گوڵزارەکەم
نەمامی مەقرتێنە
چیمەنی مەشێوێنە
بیپارێزە خاوێنی
سەربەرز یاسا و هاوینی

# یاسای گیانداران

ئەم پشیلە بۆ کوێرە؟
لە ڕۆشنایی زوێرە؟
بەردی منداڵ بە ئەنقەست
چاوێکی دابێ لە دەست؟!
پشەی ناو ماڵ و کەویی
ئاشنای سۆز و بەزەیی
بەنازی میاو میاو
ئەدوێنێ بە چەسپاو
بە بزواندنی زنجیر
دەسازێ بەزمی زەمزیر
مشکی پۆخڵ ئەلەرزێ
بە بینینی ئەبەزێ
ئارەقەی شەرمت نەتکا
یاسا دڵی لێت شکا
بەختیاریت دێتە جۆش
چاوێکت گەر کوێر بێ تۆش؟

# یاسا

بەرهەم ڕەنگینی یاسا
پەلکە زێڕینە ئاسا
داد پەروەری بڕیارت
پاک یەکسانیی ڕەفتارت
ماف و فەرمان بەرامبەر
ژینی سەربەست دەستەبەر
ڕادەماڵێ تەم ڕۆژگار
چاو هەڵنایە شەرمەزار
بزەی سەروەری و باڵا
متمانە ئەکا ئاڵا
قوتابخانە و خوێندنی
بەرنامەی ئەفراندنی
بەیاسا دەکرێتەوە
نەهامەت دەبرێتەوە
نەوەد و شەش جار بە ئینسان
قورئان زانستی ناسان
خوێندکاری کوردی ئێمەش
ئەگا بە ئەستێرەی گەش
وەک جیهانی پلە یەک
هێزی مێشک و هەست لە تەک

# یاسا لە خوێندنگە[1]

خوێندنگە بۆ خوێندنە
پەروەردەی فێرکردنە
ماڵی پیرۆزی دووەم
مەبەستی بەرزی سەردەم
پێچەوانەی ناحەزان
هەراسانی بای خەزان
تا دیاری بێ و ماف بدرێ
یاساکان پەیڕەو بکرێ
ناو پۆل و حەوش و باخی
تاق و دیوار و ئاخی
پاک و خاوێن ڕاگرین
نووکە قەڵەمی بسڕین
هاوکاری بەردەستی بین
پاڵپشتی ڕا و هەستی بین
مامۆستا و ڕێز و باسی
ستایش و سوپاسی

---

(١) لە ڕۆژنامەی (بەدرخان) (نێرگزی منداڵان) بڵاوکرایەوە

وەک دایک و باوک وابێ
دڵەکان پێی ئاوابێ
هزری منداڵ دێتە جۆش
بەپەیڤ و گفتاری خۆش
فەرمانی گشت بە چاوان
خەندەبێ هاوڕێی لێوان
خوێندکاران خوشک و برا
یاسا پەروەر و چرا
بەهۆی زانست و خەبات
دەڕوێنین داری ئاوات

هەولێر – ٢٠٠٦/١/٢٤

# بەهار[١]

لە شۆڕشی زستانا
لە با و بەفرو بارانا
چاوەڕوانم بەهار بێ
بە ئامێزی گوڵزار بێ
لەسەر ڕایەخی سەوزا
لە سایەی کانی و حەوزا
گوڵی شین و زەردو سوور
بڕوا بۆنی دوور بە دوور
دیمەن و نازی گوڵان
لابەرێ خەمی دڵان
شوان و سۆزی شمشماڵ
ئاوێتەی بەستەی منداڵ
باعەی بەرخ و گدیلە
پەپوولانی خنجیلە
خوڕڕەی ئاوی شەتاوان
سافتر لە ئەشکی چاوان

---

(١) لە گۆڤاری (هەنگ) بڵاوکرایەوە

جريوەی بولبول و مەل
هەتاوی بەفری سەرکەل
شایی و هەڵپەڕکێی لاوان
ڕوون بکا چاوی باوان
سەیران و بەهاری خۆش
ئەکا زیزبوون فەرامۆش
زاخاوە بۆ مێشک و دڵ
تا بخوێنین زۆر بە کوڵ
مرۆڤێک بین بەخشندە
گەشتر بکەین ئایندە

هەولێر – ٢٠٠٦/١/٢٥

# یاسای هاوسێ[١]

وەک ماڵی مامە هاوسێ
ڕێزی گەر نەهەرەسێ
منداڵانی خۆشەویست
ئامادەبین بۆ پێویست
لەگەڵیان بکەین وازی
تاکو دڵمان بخوازی
وانەکانمان بخوێنین
هاوکاریمان بنوێنین
ناو ماڵیان ئاگادار بین
نەیشێوێنین هوشیاربین
نەکەین بچین بۆ سەربان
سەیریان بکەین بۆ سەیران
بەرد نەهاوێین بۆ حەوشە
ڕەفتارێکی پڕ خەوشە
سەری یەکێکیان بشکێ
تــک تــک خوێنی لێ بتکێ
یاسا دەبێ شەرمەزار
دایە و بابەش بێ قەرار

هەولێر – ٢٠٠٦/٢/١٧

---

(١) لە گۆڤاری (هێلانەی منداڵان) بڵاوکرایەوە

# یاسای بازاڕ[١]

بۆ بازاڕی ڕۆیشتن
شوێن کڕین و فرۆشتن
وریا و چوست و چالاک بین
ئاگادار و دەست پاک بین
دەست بۆ کەلوپەل نەبەین
پەکی خاوەنی نەخەین
شتێکمان گەر مەبەست بوو
بۆ کڕین نەک ئەنقەست بوو
بەڕێز نرخی پرس کەین
نەوەک شەرم و ترس کەین
پەرتووک و پەڕاو، پێنووس
پانتۆڕ کراس یان بلووز
مامەڵەی گونجاو بکەین
کۆتایی ئەنجام بدەین
شتەکە نەیبێ خەوشێ
بێزاربین هەر لە حەوشێ
خاوەنی وەرناگرێتەوە
سەد جار بۆیی بەریتەوە
جا پارەکەی بدە دەست
ماڵئاوا و یاسا سەربەست

هەولێر – ٢٠٠٦/٢/١٧

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

# یاسای خزمان[1]

بابچینهماڵی خزمان
خۆشی بخزێته دڵمان
مام و خاڵ و پلەیه
گشت یەک ڕاده و پلەیه
خەنده و سۆز و سڵاوه
پاک تەمەن تێکەڵاوه
بەخێرهاتنی گەرم و گوڕ
پیرو لاو و کچ و کوڕ
دەجۆشێنی شوێنی شاد
چایی گەرم و ئاوی سارد
ئامۆژگاری و پەندی پیر
دەبن بە زانیاری بیر
یاری مناڵ و بەبە
ئێش و خەفەت لائەبا
سێو و ئاروو و پرتەقاڵ
کابان ناکا دەست بە تاڵ
بەم دیمەنە پڕ تەرزه
یاسا سەری پێ بەرزه

هەولێر – ٢٠٠٦/٢/١٨

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوه

# بووکی ساڵۆن[١]

ئاڵ ئاڵ خەملایەوە بووک
ناسک ناسک ئێسک سووک
باڵا، لەنجە لاو لاوی
دیدە کاڵ تەلیسماوی
خۆرەتاوی ڕوخساری
تەمی تاری ئەتاری
بەخەندە نەیئەڕوانی
لەمپەری بوو گریانی
بۆ زەری سەر مەشق بوو
ژنەی ساڵۆنی ئەشق بوو
لەم دیو پەردە ئاهەنگە
زەمزەمەی ڕەنگاوڕەنگە
داوەت، مۆزیک و دەهۆڵ
تابلۆی نازی کەژو چۆڵ
چریکەی سۆزی دڵدار
ئومێد و ئارامی یار

---

(١) لە ڕۆژنامەی (بەهرە) بڵاوکرایەوە

له هەورا مانگ هاتەدەر
خانزادەی تارا لەسەر
سورمە و ڕوومەت و سپیاو
ئەیشۆرێ ئەسرینی چاو
پۆلی ماشێنی قەشەنگ
پێشوازی بووکی دڵتەنگ
گوڵ و عەترو ڕازاوە
کۆشکی چەند قاتی زاوا
مەزاری تاریکی بوو
نەشتەری باریکی بوو
چنگی ژەهری پەنهانی
دوماهی تەمەن هانی
حەز و ئارەزووی دەم بێ
ڕۆح ئاشای خاتوو شەم بێ
خەجاڵەت زاوای سەکەش
مەرگی بووک گرتە باوەش
دڵی کچ بۆی لێنادە
بە لاوێ دابووی وادە

هەولێر - ٢٠٠٦/٣/١٤

## کەرکووک[١]

کەرکووکی کوردستانم
خەونی خۆشەویستانم
کەرکووکی باوە گوڕگوڕ
پێشمەرگە من کچ و کوڕ
مەزاری ناحەزانم
بۆ پیلانیان خەزانم
لانەوازیم ئەستەمە
ناپەسندیی سەردەمە
جۆباری زێڕی ڕەشم
نابینرێ گەردێ بەشم
چەوت لە سایەی نیشتەوە
دڵۆپێ نەیهێشتەوە
بەگەنجینەی ئەژمێرێ
بە گەنجانی ئەسپێرێ
دانابڕێم لەم وڵاتە
دابڕان کارەساتە

(١) لە ڕۆژنامەی (بەهرە) بڵاوکرایەوە

مێژوو ڕەشی ئەپۆشێ
تادێ دەروون ناخرۆشێ
شێرکەڕا بوو لە لانە
ئەیسەلمێنی بەوانە
مۆخ بە ڕووی خاکا ئەپژێ
چاو لە پێشمەرگا ئەڕژێ
ستەم دێنێ کۆتایی
بە ئارەقەی ڕیسوایی
ڕازی خونچەی پشکووتوو
کوردستانی یەکگرتوو

هەولێر – ٢٠٠٦/٣/٢٥

# مامە پیرە[١]

ئەم مامەیە چەند پیرە
چەند پیرە هێندە ژیرە
وشیار و شارەزایە
خاوەن کوڕ و کوڕزایە
نائارام و عاجزە
گوێی گرانە و چاوی کزە
پشی تەنگە بێ وچان
پشت کۆم و دەست بە گۆچان
هەموو لەشی ئەلەرزێ
هەر بۆ تەنیایی ئەخزێ
ڕێزی پێویستە بگرین
زانیاری لێی وەربگرین
پەیڕەوی ئامۆژگاری
تاقیمانەی ڕۆژگاری
نواڵە و سێبەرمانە
شانازی تاسەرمانە
کۆمەڵ ئەگەشێتەوە
وڵات ئەدرەوشێتەوە
ئێمەش وەک ئەو پیر ئەبین
لە ژیانا زویر ئەبین

هەولێر - ٢٠٠٦/٣/٢٨

---

(١) لەڕۆژنامەی (بەدرخان) بڵاوکرایەوە

# بابەتی هزری

چاری چارە ⟵ ٢٠٠٦/٤/٤

چاروچارە ⟵ کاتژمێر چوار و چوار خولەکە

چار و چارە ⟵ ٤+٤ = ٨

چار چار ⟵ ٤x٤ = ١٦

چارە چارە ⟵ چارەسەر (عیلاج)

هەولێر - ٢٠٠٦/٣/٢٨

# ژینگە[١]

ژینگە و هەوای خاوێنی
هەوێنە بۆ هاوینی
بۆ پایزە مامەی جووتیار
وەرزی زستان و بەهار
پەسەندیدەی پزیشکی
هاوکار هەتاو و تیشکی
تەریب و کارێگەرن
پێداویستی بەشەرن
بۆ جەستەو سڵامەتی
ژیرو خولق و تاقەتی
بۆ قوتابی و چالاکی
ڕێبازی هزری چاکی
دایە و بابە بەجۆشتر
بۆ زارۆک مەیلی خۆشتر
پەروەردەی سەردەمییانە
ئاوازی سەر دەمیانە
زانست و هەنگاو هاوێژ
هۆی ڕووناکبیری و ڕاوێژ
نەوەی نوێ بەختیار
ژینگە سەربەرزی ڕۆژگار

هەولێر – ٢٠٠٧/٣/٢٨

---

(١) لە گۆڤاری (مشکە) بڵاوکرایەوە

# پشووی هاوین[١]

ئەمساڵیش واسەرکەوتم
لە خوێندنا نەسرەوتم
فێرگە دەرگاکەی داخست
پشوو ڕایەخی ڕاخست
جەستەو مێشک بسرەوێ
هێمن و هێور بخەوێ
ببەخشێ بەرامە و بۆن
بەرنامەی تەلەفزیۆن
ببێ بە خولیاو پیشە
گۆڤار خوێندن هەمیشە
کۆمپیوتەر و هەڤاڵان
لە ڕێکخراوی منداڵان
زانیاری تازەی پتر
بۆی هاتوچۆ بێ ئیتر
ئەنتەرنێت و ئاریافۆن
مۆبایل و تەلەفۆن

---

(١) لە گۆڤاری (هەنگ) بڵاوکرایەوە

ئۆتۆمبێل و فڕۆکە
چیتر هەبێ ئەمڕۆکە
بەکۆشش هاتە بەرهەم
بەهێز زانستی سەردەم
خۆم سا ڕۆشنبیر دەکەم
ستێتی لە بیر دەکەم
نیشتمانم ئاوابێ
هاوشانی ڕۆژئاوابێ

هەولێر - ٢٠٠٧/٤/١٣

# باپیر(١)

باپیر بابەی بابەیە
بۆ ماڵ سەبرو تابەیە
بەڕێدەکا ڕۆژگاری
هەردەم بە ئامۆژگاری
وشەکانی دیارییە
هیوای بەختیارییە
دەیبینین بە ڕووخۆشی
دڵدارم و خامۆشی
دەڕژی خەندەی لە کانی
ماچ دەکا نەوەکانی
بۆ کێشە بە پەلەیە
ناهێڵێ ئەم هەڵەیە
دایەی بە کچی دەژمێرێ
بە یەزدانی دەسپێرێ
دایەش ڕێزی زۆر دەگرێ
هاوکارە تا بۆی دەکرێ
بابە دەست لەسەر سینگە

---

(١) لە ڕۆژنامەی (بەدرخان - نێرگزی منداڵان) بڵاوکرایەوە

ئەم هەڵوێستەی گرینگە
شایستەی کوردەواری
گفتار لە تەک ڕەفتاری
زۆر سوپاس بابە حاجی
قەت قەت لەبیرمان ناچی

هەولێر – ٢٠٠٧/٤/٢٣

# بێخاڵ[١]

کۆپیی ڕووباری بەهەشت
سەری بڵندە بۆ گەشت
کۆمەڵێ تاڤگە و سۆلاف
نازانن شێوازی لاف
بێخاڵی ڕواندزە
وڵات دێنێتە بزە
وڵاتی کوردستانم
گەوهەر و زێڕستانم
گەشتیار لە سایەی سابات
ئارام ئەگرێ سات بە سات
چێشت و گۆشتاو میوەجات
سکی مەستی شادو لات
نوکتە و یاری و پێشبڕکێ
تەپڵ و نایە و هەڵپەڕکێ
شەپۆڵی ئاوی تەزی
ئازیزە لێو ئەگەزی
شیرە چەمانی پڕ کرد

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

گڕی دەروونی قڕ کرد
ماسی هەڵبەز و دابەز
دیمەنی باڵای گۆڕەز
لەنجەی درەختی چنار
سەمای پەپوولە جار جار
غەمبار پێ بەختیار ئەبێ
لە غەم دەستبەردار ئەبێ

هەولێر - ٢٠٠٦/٤/٣٠

# شەش مانگ[١]

درِک لە شوێن گوڵستان
ژووری گۆڕی بە داستان
تۆراوە ئاشتی و سڵاو
سارا سارد کاسە شکاو
کامەرانی خنکاوە
لە خێوەتی ئاژاوە
بەچە نا ئارام بێناز
دەروون وێڵی سەدان ڕاز
دەرئەدا لێی هەتیوی
ڕۆندکە چێشت و شیوی
ماڵ هاوسێی لا پەسندە
نابینایە ئایندە
باوک عاشق بریندار
بێبەری لە ڕووی دڵدار
بە کەسێ دایان بە شوو
لە باب بە تەمەنتر بوو
ئاڵتوون شاڵاوی هانی

(١) بەرواری ٢٠٠٦/٦/١٢ لە ڕۆژنامەی (زاری کرمانجی) بڵاوکرایەوە

ڕژا چاوی باوانی
لاشەی ئەڤینی بێگەرد
نێژراوە لە گەردە گەرد
هەردەم بۆ یادگاری
سەردەمی هەرزەکاری
ڕۆژانە بۆی دەرئەچێ
نەبووە وەک خۆی ملکەچێ
بەشکو مانگی لەیلایە
هەڵبێ بۆی لە بێڵایە
خەندە و سڵاوی کاکڵێ
شەش مانگ خەم ڕادەماڵێ

هەولێر – ٢٠٠٦/٦/٢

# منداڵی یەك كۆڵانین(١)

منداڵی یەک کۆڵانین
خۆشەویستی ماڵانین
یەک بۆ یەکتر هاوکارین
هۆی خۆشحاڵی ڕۆژگارین
دەکەین تۆپانێ و یاری
بۆ شادی و وەرزشکاری
بۆ ماڵان نایهاوێژین
نەبا زیان ببەخشین
زیز نەبن مامە و پلە
ڕێزدارن گشت هاوپلە
نەوزاد و نازە و نەبەز
پاک هەڤاڵ بەهەرەوەز
خاک بە گەسک دەماڵین
زبڵ و سیان ڕادەماڵین
کووچەو کوڵان خاوێن بێ
بۆ خەندەی لێو هەوێن بێ
بیسەلمێنین خوێندکارین
بۆ کورد خزمەتگوزارین

هەولێر- ٢٠٠٧/٦/١٧

---

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

# پایسکل[١]

پایسکل یان دوو چەرخە
هۆکارێکی بە نرخە
پاسکل بە ئینگلیسی
بە دوو چەرخەش ئەیبیسی
ناوزەدەی مرۆڤی کورد
کاراو خێرا هزری ورد
چەند خۆشە سواربوونی
گەڕەک و هاتوچوونی
ساکار، نە گاز و بەنزین
زوو زوو بۆی دادەبەزین
هەمە ئاهەنگ لە ئاستی
وەرزش و تەندروستی
بۆ فێرگە و لای هاوڕێ و کەس
بچۆ ئاگادار بە بەس
خۆت مەکێشە لە خەڵکی
مەبادا بزرێ کەڵکی
ئەشێ ئازار ببەخشی
ببتە مایەی سەر ئێشی
هەڵبچی و هیچ نەبێنی
بە بەرد و دار بیشکێنی

هەولێر – ٢٠٠٧/٦/٢٣

---

(١) له ڕۆژنامەی بەدرخان پاشکۆی (نێرگزی منداڵان) بڵاوکرایەوە

## ژیان(١)

تۆ چەند بە بەختی ژیان
دڵشکاندن پیشەتە
تۆچەند بێ بەختی ئینسان
ئەسیری تا ریشەتە
ژیان ڕەنجان مەحاڵە
نازی هەڵدەگری بەگیان
کچۆڵەی خوردەساڵە
ڕەهایە ملّک و سامان
منداڵدانت بەجێ هێشت
چزووی دنیا لە شانت
شەکراوی شەوارەت ڕێژت
ناشادم بە گریانت
بەچە یا هەرزەکاری
ناز ئایندەت کێشەتە
بۆ دوندی خوێندەواری
ترسی کۆستی بێشەتە
وادەی سا هاوسەرگیری

---

(١) لە ڕۆژنامەی (هەنگ) بڵاوکرایەوە

مۆتەکەی هێرشی پارە
مشووری سوکنا و بیری
بەرهەم کۆرپە و ئازارە
چڕنۆکی پیری سەرکێش
سەد تیر دەستەو یەخەتە
پەرپووت و خومار و گێژ
مەرگی خێرات حەسرەتە
سوپاس جیهانی جوان!
گیان دەست بەردارم بە
قەدر گران بوو میوان!
لەم دیو شناسکارم بە

هەولێر - ٢٠٠٦/٦/٢٤

# پارە[1]

دەیجووری جەنگ barووتی شەڕ
خوێن جۆباری بەلێشاوە
سوپای پارە خراوەتە گەڕ
لاڵە یاسا دەنگ نووساوە!!
نەفس نزمی مورغی پارە
ناکەسکارە ئەیپەرستێ
بەندی دیدە پەپکە مارە
قرۆشی نەگاتە دەستێ
ڕۆح ئەفرێنی جەمی چەور
(سک ساکار بێ، نەوسن نەبێ)!
ژن ئاڵوودەی تیری جەور
ناحەزی گشت مردن نەبێ
پارە ئاوێز زەردەی گەزەنگ
بۆ هەناسە و دنیای تاسە
بۆ تەلارو یاری قەشەنگ
پارووی بە وەج جلی تازە
بۆ لانەواز خوێش و خزم
بنکەی زانست کۆشکی هونەر
پارە ڕابەر میکانیزم
درەختێکە شیرین نەزەر

هەولێر - ٢٠٠٦/٧/١

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

# پاییز[١]

تۆ چەند بە بەختی ژیان

مژدە وەرزی پاییزە
هێنای گوڵە گەزیزە
ڕەنگ زەردی ڕوخسار کۆکە
وەک پەرچەمی بووکۆکە
کەش و هەوای دەگونجێ
کەس لە ڕۆژگار نەڕەنجێ
لە حەوشە و شەقامی شار
هەڵدەوەرێ پەلکی دار
بۆنی بارانی خۆشە
منداڵ نەغمەی بە جۆشە
دەڵێت: باران بەخێرێ[٢]
هۆ کۆترۆکەی هەولێرێ
چاوەڕێتە زەوی و زار
بباری پتر لە پار

---

(١) لە ڕۆژنامەی (هەنگ) بڵاوکرایەوە

(٢) سوود لە شیعرێکی فۆلکلۆر وەرگیراوە

دنیا پڕ دەغڵ و دانی
پڕ حەوز و ئاو و کانی
دایە و بابە بەختیار
سەربڵندی بۆ جووتیار
خوێندکار چالاک لە فێرگە
مەل دەفڕێ و مەیلی مێرگە

هەولێر – ٢٠٠٦/٧/١٦

# بۆ مزگەوتی (محەممەدییە - حاجی قەرۆك)(١)

ئیسکان - هەولێر

بەختیارە هەر کەسێ
بەکاری چاک هەڵئەسێ

بۆ کردگار بێ تەنیا
دوور لە شانازی و ریا

مزگەوت و بیناکردن
ئازووقەی باڵای مردن

دە تەلارە پاداشی
ئاکام کردەوەی باشی

یەک بە هەزارە نوێژی
پایەی بەهەشت ئەچێژی

نرخدار حاجی جاسم
دڵشادم کە ئەتناسم

باوکت حاجی محەممەد
خێرخوازی بەهیممەت

پشت بە خوا ئیمانی برد
ئەم مزگەوتەی دروست کرد

هەولێر - ٢٠٠٦/٧/٣١

(١) أ- لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە
ب- بەرواری (٢٠٠٦/٩/١٤ لە هەمان مزگەوت ئەم شیعرە بە نووسینێکی خۆش لەناو جام و چوارچێوە لە ژووری پێش نوێژ هەڵواسرا.

# مشکه[١]

مشکه به‌ژنی بچووکه
ڕه‌نگ بۆره‌ی پێست به تووکه
خرپن و گوێچکه سووکه
بێ ئازار و چڕنووکه

* * *

له پشیله زۆر ئه‌ترسێ
ناهێڵێ پێی بوه‌سێ
هه‌ر کاتێ بۆی دابه‌زێ
له کونه‌که‌ی خۆیا ئه‌خزێ

* * *

هه‌ر له ژووی زه‌خیره
ڕائه‌کاو چه‌شنی تیره
شه‌یدای ڕۆن و په‌نیره
هیچ ناخوا خۆ فه‌قیره!

* * *

هه‌ر ته‌نیا دوو ساڵ ئه‌ژێ
شه‌ش یاحه‌وت فه‌رخه ئه‌زێ
گۆشیان ئه‌کاو نابه‌زێ
به ڕه‌حمه و نایانگه‌زێ

هه‌ولێر - ٢٠٠٦/٨/٢٤

---

(١) له گۆڤاری (مشکه) بڵاوکرایه‌وه

# پەشیمان[١]

قەت ئەمساڵ وەک پار ناکەم
قەت خۆم شەرمەزار ناکەم
قەت ڕەنجی ساڵێک تەمەن
نایکەم بێناز لە گوڵشەن
قەت نایدەم کات بە فیڕۆ
ئەرکە و ئەیکەم من گرۆ
چەشنی ڕێباز و چنوور
تا سەر کۆشش بێ سنوور
پارەکە جێیان هێشتم
ئەشکی چاویان پێ ڕشتم
هۆشیار بوون و نەسرەوتن
ساڵێک بە پێش من کەوتن
لە بێخی دڵ تا زمان
پەشیمانم پەشیمان
فەرزەو خوێندنی باڵا
ناز پەروەر بێ وەک ئاڵا
زانست لە پێناو وڵات
لە خزمەت بێ سات بە سات

هەولێر - ٢٠٠٦/٨/٢٦

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

# بەفر[١]

کاتێ بەفەر دەبارێ
لە گوندێ یا لە شارێ
کڵۆ کڵۆ لە ئاسمان
لە حەوشە تا پێش هەیوان
دەبینرێ بە کڕو کپی
دیمەنی سپی سپی
دەکەین تۆپە بەفرینە
وەرزش و پێکەنینە
بۆ ڕوخسار مەها وێژە
ئازاری پێ مەچێژە
بووکە شێرەکی بە بەفرێ
خۆشەو تەماشای دەکرێ
بەفر سایەقە دێنێ
بەلۆعە ئاو ناهێنێ
جۆگە و کانی دەبەستێ
بەس ئاگر پێی دەوەستێ

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

دەبەین زوو زوو خلیسکە

شکستەی قاچ و باسکە

میکرۆب هەمووی قڕ دەکا

ئاو کشتوکاڵ پڕ دەکا

دەخۆین بەرهەمی جووتیار

شادان و گەل بەختیار

هەولێر – ٢٠٠٦/٩/٦

# فێرگە گەڕایەوە[١]

فێرگە وا گەڕایەوە
دڵم پێی کرایەوە
بۆ پێشوازی ئامادەم
هەڵیدەگرم جانتاکەم
پێنووس، پەرتووک و پەڕاو
کەلوپەل هەموو تەواو
بۆ فێرگەو ناو باغ و پۆل
گۆڕەپان، وەرزش و گۆڵ
بۆ خوێندکار و برادەر
مامۆستاو وشەی گەوهەر
زانیاری تازەی بە سوود
وێنە و هۆنراوە و سروود
چران بۆ بیر و هەستم
لەماڵەوەش ناوەستم
من هەمیشە دەخوێنم
پلەی باش بەدەست بێنم
لە ئەنجام دەبێ دەرچم
تا بیسەلمێنم مەرجم

هەولێر - ٢٠٠٦/٩/١٣

(١) لە ڕۆژنامەی (نێرگزی منداڵان)ی بەدرخان بڵاوکرایەوە

# پێشەنگین[١]

خوێندکارین گشت هۆشەنگین
پشت و پەناو پێشەنگین
ئامادەین بۆ هاوکاری
هەڤاڵ و بەختیاری
مامۆستا سەروەرمانە
وەک باوک ڕابەرمانە
پاڵپشتی عەقڵ و ژیری
ڕەوشت و ڕووناکبیری
زانست ئارەزوومانە
کۆشش ئەرک و خوومانە
بۆنخۆشین خۆ دەشۆرین
جل و بەرگمان دەگۆڕین
پێڵاومان بۆیاغ دەکەین
شێوەی گوڵەباغ دەکەین
بۆ چاکسازی ملکەچین
لە گرفتا دەربچین
نەمامی ناو بێستانین
ئایندەی کوردستانین

هەولێر - ٢٠٠٦/٩/١٩

---

(١) لە گۆڤاری (پێشەنگ) بڵاوکرایەوە

# برای گەورە[١]

برای گەورە لە ماڵێ
ناخۆشی ڕادەماڵێ
شوێن باوک دەگرێتەوە
دڵمان پێی دەکرێتەوە
دەس بەسەرمان دادێنێ
قژمان ڕەنگە دابێنێ
بۆ خوێندنمان هاوکارە
ئامادەو ئاسانکارە
ڕوومان هەرگیز ناشکێنێ
مەبەست و مژدەی دێنێ
بە ئێمە سەر بڵندە
خوازیارە لە ئایندە
بە بڕوانامەی باڵا
ڕێزدارتر بکەین ئاڵا
گەر برا ئاوا ئەبێ

(١) لە گۆڤاری (مشکە) بڵاوکرایەوە

ماڵ شادە و ئاوا ئەبێ
خۆ بە پێچەوانەیە
ژیان بەندیخانەیە
خوشک و برا پەست و زیز
برای گەورە نا ئازیز

هەولێر - ٢٠٠٦/٩/٢٤ - دووەم ڕۆژی مانگی پیرۆزی ڕەمەزان

# ئەوسا و ئێستا[١]

لە بازنەی ئومێدی سەرابا
ڕۆندک قەتیس ماوە سەراپا
ئارام و ئاژاوەیە ژیان
زاڵترە ئاژاوەی ئێش و ژان
ڕێژەی هاونشین ئەوسا کەم بوو
حەوت ملیۆن بۆ نیشتمان خەم بوو
گەوهەر بوو قنیات نادۆزرێتەوە
لە نەواو دەرفەت ناقۆزرێتەوە
ئەیخزاند هەنگاو بۆ زۆربەی ماڵێ
لوقمەی چەور چەند جار لەساڵێ
ئەیپێکا مەبەست تابلۆی ئاکام
بە بەشە ڕووز ئاسوودە و ئارام
شەوارەی شاد گرد دەبوونەوە
ڕۆژانەی ڕەنج بیر دەچوونەوە
تۆراوە وڵات ئێستا هێزی

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

بیست و حەوت ملیۆن ها لە ئامێزی
فرە خاوەن دراو و دۆلار
هاوسەری شەنگ ماشێن و تەلار
ماڵ و لالەزار ئاوێزەی بەهار
جەمی بەوەج سەبیلی بۆندار
کوڕ گەل بزە نایبزوێنێ
قینات بێ مەیلەو مەل نادوێنێ
دێ مۆڕەی ئاشووب فتیلەی شەڕ
ئاسۆ خەجاڵەت، عەداڵەت کەڕ!!
نا قبووڵیی خوازیاری سەردەم
بۆ زێڕی ڕەش ئاماژەی ستەم

هەولێر – ٢٠٠٦/١٠/١٠

# نەورۆز و پیرەمێرد(1)

سەیری ئەم کێو و هەردە
ئەم دەشت و دار و بەردە
ڕازاوەیە و بێگەردە
چونکە نەورۆزی کوردە

❊ ❊ ❊

بەفری شاخ توایەوە
کانیاوی هێنایە
گوڵاڵە بووژایەوە
چونکە نەورۆزی کوردە

❊ ❊ ❊

باعەو بۆڕەی ئاژەڵە
مەڕو بزن و بەرغەڵە
مەل و باڵدار تێکەڵە
چونکە نەورۆزی کوردە

❊ ❊ ❊

خۆشە گەشتی دەم ڕووبار
لەژێر سێبەری چنار

---

(١) لە گۆڤاری (هەنگ) بڵاوکرایەوە

بۆ سەیران و لالەزار
چونکە نەورۆزی کوردە

* * *

بڵێین سروودی نەورۆز
سڵاو و یادی بەسۆز
بۆ پیرەمێردی دڵسۆز[٢]
چونکە نەورۆزی کوردە

* * *

دەژێ لە هزر و هەستا
بیرەوەریی مامۆستا
حەوتا و یەک ساڵ تا ئێستا
جەژنە و نەورۆزی کوردە

هەولێر – ٢٠٠٦/١٠/٢٤

(٢) مناڵە خنجیلانەکان.. شاعیر -پیرەمێرد- یەکەم کورد بووە کە نەورۆزی تازە کردۆتەوە لە ساڵی ١٩٣٥ ز.

# جەژن(١)

جەژن چەند خۆشە جەژن
جەژنی منداڵ و مەزن
جەژنی کوڕو کچۆڵان
لاوی شارو شەنگۆڵان
جەژنە و بەختیاری دڵە
ئاو ڕشاندنی گوڵە
سەردانی هاوڕێ و کەسە
خەندە و دەست لەناو دەسە
دەچین بۆ چەرخ و فەلەک
دادەبەزین بۆی گەلەک
دەکەین یاری و تۆپانێ
کچانیش بۆ جۆلانێ
کێک و نوقڵ و کولیچە
لەگەڵ مەم و مەنیجە
تێر دەخۆین و دەینۆشین
جلی تازە دەپۆشین

(١) لە ڕۆژنامەی بەدرخان و پاشکۆکەی (نێرگزی منداڵان) بڵاوکرایەوە

ئێوارەش پارکی شارە
بۆ دنیای جوان بنوارە
لەگەڵ بابە بە ماشێن
بۆ سەوزایی ئاوپڕشێن

هەولێر – ١٦ی ئاب ٢٠٠٧

# سالار[١]

سالار ناکا لاساری
دووره لە چەوت و لاری
دڵ کانیاوی خاوێنە
بۆ چاکسازی هەوێنە
بۆ بابە و دایە ڕێزی
سەرجەم ماف دەپارێزی
دەبەخشێ سۆزو ئارام
لە ماڵ و فێرگەو شەقام
ئاواتە خوازە خەڵکی
بدرەوشێتەوە کەڵکی
زیرەک و ڕووناکبیر بێ
نیشتمانی لەبیربێ
قوتابی هەڵکەوتووبێ
ساڵانە سەرکەوتووبێ
نەچێ ڕەنجی بەهەدەر
بلبلی زانست پەروەر

(١) لە گۆڤاری (پەلکەزێرینە) بڵاوکرایەوە

سەری بڵندبێ ئاڵا

بە بڕوانامەی باڵا

بڵێ: ئەمڕۆژەم ئەویست

کوردستانی خۆشەویست

هەولێر – ٢٠٠٧/٩/٢

# بخوێنە[١]

بخوێنە تا دەربچی
شاد دەبی کوڕ یا کچی
بخوێنەو ماڵ بەختیار
دایە و باب لە چاوەنواڕ
لە کۆمەڵگا دیاری
ڕۆشنبیر و هوشیاری
ئومێدی کورد بازووتە
پرشنگی ئارەزووتە
وەک گەلانی بەرزو ژیر
بە قەڵەمی مێشک و بیر
هێزی زانست پشتابێ
ورەت بڵندو ڕشت بێ
بڕازێنەوە ڕۆژگار
پڕ پەپوولە و لالەزار
ناحەز بنێ شکستی
بڕمێ مەرامی خەستی
ستەم ڕوو لە هەرەسە
ئازادی باڵا دەسە

هەولێر - ٢٠٠٧/١٠/١٠

(١) لە گۆڤاری (مشکە) بڵاوکرایەوە

# شووشەی ساردی مەشکێنە[١]

شووشەی ساردی مەشکێنە
دڵی خەڵکان مەشکێنە
هاوپۆلت زامدار نەبێ
بە ئێش و ئازار نەبێ
ناچاری دکتۆر نەبێ
پەنای بۆ غەمخۆر نەبێ
لە خوێندنا دانەبڕێ
خەم دەروونی دانەگرێ
نەبا نیگەران بێ لێت
سەرزەنشتی بڵێ پێت
ئەتۆش نا ئارام بی بۆی
بشێوێ وەڵام و هۆی
هەڵەکار پەشێمانە
پەشیمان پەرێشانە
بۆ کاری خێر وریا بە
شاد دەبی دڵنیابە

هەولێر – ٢٠٠٧/١٠/١٩

---

(١) لە گۆڤاری (مشکە) بڵاوکرایەوە

# چیا[(١)]

چیا باڵاکەی بەرزە
وەک کوڕە لاو بە تەرزە
دەبینرێ درەخت و داری
لە لووتکە تا بناری
گوڵ و لالەی ئامێزی
سەوزە گیای فرە وەرزی
ڕایدەماڵێ تەمی ئاخ
قاسپە قاسپی کەوی شاخ
بولبول و قومریی شێوان
شمشاڵی شادی شوان
لە هەڵبەز و دابەزن
مەڕو ماڵات و بزن
دایدەپۆشێ گشت هەردی
بەفری زستانی سەردی
دەردەچن کانی و جۆگە
دەیخۆنەوە بەرخۆکە

---

(١) لە گۆڤاری (مشکە) بڵاوکرایەوە

بەهاری خۆشە بۆ گەشت

دێنێ دیمەنی سەد دەشت!

بەدنیاز بوو گەر دەستێ

ئەستەم بستێنێ بستێ

ڕۆڵە.. هۆشیار و گوردە

دەیسەلمێنێ کە کوردە

هەولێر – ٢٠٠٧/١١/١١

# بەزەییت بێ بە ئاژەڵ[١]

بەزەییت بێ بە ئاژەڵ
مەڕ بێ بزن یا بەرغەڵ
مامرو مراوی و کۆتر
سەگ و پشیلە و هی تر
گا بەڵەک یا گوێدرێژە
بەردیان بۆ مەهاوێژە
خوێن لە لەشیان دەچۆڕێ
شادی بە ئێش دەگۆڕێ
ئەچێژێ زامی جەستە
ئەنجامی هەڵەی دەستە
ناستێنێ تۆڵەی تاوان
ناسڕێ فرمێسکی چاوان
خاوەنیان گەر ئەزانێ
خێرا شاڵاو ئەهانێ
دەخلیسکێ تاسەو خەندە
بە گلەیی و گازاندە
غەمگین و دڵگیر ئەبێ
خۆت لە خۆت زویر ئەبێ
کاری بەد و ناڕەوا
پێچەوانەی ویستی خوا

هەولێر - ٢٠٠٧/١٢/٩

---

(١) لە ڕۆژنامەی بەدرخان (نێرگزی منداڵان) بڵاوکرایەوە

# ئەم منالە هەژارە[1]

ئەم منالە هەژارە
وێڵی شەقامی شارە
دێ و دەڕوا هەموو ڕۆژێ
کێک و نوقڵ دەفرۆشێ
شتێ تا دەستەبەر بێ
نەختێ پەناو سێبەربێ
ڕەنگە نەزانێ یاسا
بەپێی بڕیاری تازە
نابێ کار بکا منالڵ
تا تەمەنی پانزە ساڵ
بە ماڵ بەندە ژیانی
پۆشاک و خەرجی و نانی
تۆ بۆ بەردی تێ دەگری
لەچاویا ڕۆندک دەسڕی؟
بەشکو بێ دایک و باوکە
لە ماڵێکە.. هیلاکە
حەز ناکەن بە کڵۆڵان
هەر ڕابوورن لە کۆڵان
ڕێزگرتنی پێویستە
ئاشتی کەوە هەر ئێستا

هەولێر - ٢٠٠٨/١/١

---

(١) لە ڕۆژنامەی (رونیا) بڵاوکرایەوە

# ئاگر[١]

ئاگر ڕەنگی سۆرە
سوود و خۆشیی زۆرە
لە سەرمای زستانە
ماڵ گەرم و شادانە
بۆ چێشت و چالێنان
سەموون و نان برژان
بۆ ئاوی گەرمی کۆڵ
دژ چڵک و تۆزو خۆڵ
پاکی بۆت خەڵاتە
گوڵ ئاشنای باڵاتە
هۆشیار بە لە زیانی
نەبادە نەیزانی
نەوت و غاز و چەرخە
گورج بە خۆت بەدەرخە
نەیسووتێنی دەستت
کابۆی شینی خەستت
دانەبەزن لە شانتا
کەل و پەل و جانتا

هەولێر – ٢٠٠٨/١/٥

---

(١) لە گۆڤاری (مشکە) بڵاوکرایەوە

# ئاژاوە[١]

من منداڵێکم هۆشیار
شادیم دەوێ لە ڕۆژگار
حەز ناکەم لە ئاژاوە
ئازاری بە لێشاوە
خۆی خزانە هەر شوێنێ
گوشادی دەشێوێنێ
ماڵ ئاژاوەی تێکەوێ
مەلی ئارام ناسرەوێ
دایە و بابە هەراسان
مانای نامێنێ هاسان
فێرگە ئاژاوەی ئەبێ
زانستی ئاوا ئەبێ
سەر دادەخا تەباشیر
قەڵەم شکاو و زویر
ئەدی وڵاتی مەزن
ئاژاوەی بۆ دابەزن
خەندە لە لێو دەڕەنجێ
لەگەڵ سەردەم ناگونجێ
بابڕووخێ ئاژاوە
دڵی من لێت شکاوە

هەولێر - ٢٠٠٨/١/٩

(١) لە گۆڤاری (هەنگ) بڵاوکرایەوە

# تۆپانێ[١]

تۆپ تۆپێن یان تۆپانێ
خۆشە لە گۆڕەپانێ
کۆوەبن دەی مندالآن
لەم سەر بۆ ئەمسەر کۆلآن
با ڕابکێشین هێڵی
ڕاست بێ نە بە چەوێڵی
سازکەین دوو تیپی چالاک
بکەین یاری چوست و چاک
کام تیپ بردیەوە یاری
لەگەڕەکتا تۆ دیاری
هاوکارییە تۆپانێ
شادە ئەوەی ئەیزانێ
بۆیە باشە گۆڕەپان
دوورە لە حەوشە و سەربان
کەس لێت ناهێشێ دڵی
لەبەر چاوان وەک گوڵی
خوێندنیشت لەبیر نەچێ
دەروونت پێی هەڵنەچێ

هەولێر - ٢٠٠٨/١/١٨

---

(١) لە ڕۆژنامەی (رونیا) بڵاوکرایەوە

# دایك و باوك[١]

بۆچ بێژی پێم هەتیوە؟
چون باوکی خۆم نەدیوە
ناوهێنان ئا بەم شێوە
دەروون ناخی پەشێوە
هەر چەند نەماوە باوکم
لە ژینا یاخۆ دایکم
باوەشی گەرمە هێندە
سەرم پێی زۆر بڵندە
چاوی لێمە هەمیشە
حەسرەت نەکەم بە پیشە
دڵم دایم ڕادەگرێ
چیم پێویستە بۆم دەکڕێ
هەست ناکەم کە بێ باوکم
لە گرفتا بێباکم
تکا کارم خودایە
تەمەن درێژ بێ دایە
بابەش هەواری خۆش بێ
دڵارام و خامۆش بێ

هەولێر – ٢٠٠٨/١/٢٥

---

(١) لە ڕۆژنامەی (ئاشتی نامە) بڵاوکرایەوە

# پشیلە[1]

پشەپشە پشیلە
چاو سەوزەکەی خنجیلە
وەک گفتوگۆ و قڕەقڕ
لەسەر چیتە مڕەمڕ
یا برسیتە یا تینوو
یا بۆ فەرخەکەت ماندوو
مشک کاتێ دەیبیسێ
هەتا ئێسقان دەترسێ
بۆ کونەکەی خۆیا دەخزێ
بێچووی هەناوی دەزێ
دوژمنی مرۆڤە مشک
دێنێ کۆلێرە بێشک
پشەکە پێی دەوەستێ
ئاسوودە نییە بستێ
دە بەی بەی لە من بکە
پشیلە خرپنەکە

هەولێر – ٢٠٠٨/١/٢٨

---

(١) لە گۆڤاری (مشکە) بڵاوکرایەوە

# حەمرینی بەرخەوان[١]

بڕوانە ئەم بەرخانە
حەمرینیان بەرخەوانە
حەمرین لە شاخی حەمرین
مەستی سارێژی برین
بەرخ دەلەوەڕێنێ
بەختەوەری دەدوێنێ
ئێژی ئۆخۆی خاکەکەم
کوردستانە پاکەکەم
ئەدەم ئەنگوست لە بلوێر
بۆ پێدەشت و بۆ زەنوێر
ئەچڕم بەستەی ئازادی
بە کۆتادێ ناشادی
لە هەڵبەزو دابەزن
بەرخ و کارۆکەو بزن
کات هەتا ئێوارە
خۆی ئارامی ڕۆژگارە
بەنادیدەی دڕک و داڵ!!
سڵاو لە کورد ماڵ بە ماڵ

هەولێر - ٢٠٠٨/١/٣٠

---

(١) لە ڕۆژنامەی (رونیا) بڵاوکرایەوە

# دەرچوو[١]

کوڕ و کچە قوتابی
نەخوێنی دەرچوو نابی
دەرچوو دەروونی شادە
لای خزم و خانەوادە
دوورە لە پرتە و بۆڵە
گشت ئێژن بژی ڕۆڵە
ڕێک و پێک و عاقڵی
تاسە و ئارامی دڵی
بە تۆ سەرمان بڵندە
ناز پەروەرە ئایندە
ماف و بەرژەوەندیی گەل
نایشێوێنی بازوقەل!
ناز ئەبەخشێ لالەزار
هەوای سازگاری ڕووبار
بەرهەمی هەمەچەشن
ڕۆژان نەورۆز و جەژن
دایە و بابەی خەمخوار
بێو بە خەندە و بەختیار

هەولێر - ٢٠٠٨/٤/١٦

---

(١) لە ڕۆژنامەی (رونیا) بڵاوکرایەوە

# هاوین[١]

بەهار ڕۆیشت هاوین هات
زەردبوو سەوزایی قەڵات
هەولێرو گشت کوردستان
گەرمێنێ تاکو کوێستان
بە چەندین چەشن و جۆرێ
کەش و هەوا دەگۆڕێ
کوێستان پلەی ناوەنجی
بۆنکە لالەو ترنجی
ناکا مرۆڤ هەراسان
شێوە سەیرانی نیسان
گەرمای گەرمێن مەپرسە
دەروون چلۆن پێی قەڵسە
فرە ئەسرین ئارەقە
ئاوی ساردومان گەرەکە
ئنجا دڵ لێی ناهێشێ
پاک زەحمەتی ئەکێشێ
وڵاتە و خۆشەویستە
ناز پەروەریی پێویستە

هەولێر – ٢٠٠٨/٤/١٩

---

(١) لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

# قوتابخانه کرایەوە[1]

وەک جەژنە ئەم بەیانە
ئەچم بۆ قوتابخانە
دەروازەی کرایەوە
خوێندکار بۆی گەڕایەوە
ئیدی تا هەشت مانگی تر
هاتوچۆم ئەبێ ئیتر
لە پۆلی نوێ ئەخوێنم
گوڵی زانست ئەڕوێنم
تێئەکۆشم هەمیشە
من کردوومە بە پیشە
بە زانست و زانیاری
هوشیار و بەختیاری
گەشە ئەسەنێ وڵات
پێمان ئەبەخشێ خەڵات
نافوورە و پارک و گوڵی
چیمەن و درەخت و چڵی
(ڕۆژ باش یاریگای شاری)
ئەیبێژێ پڕ بە زاری

هەولێر - ٢٠٠٨/٨/١٠

(١) لە گۆڤاری (مشکە) بڵاوکرایەوە

# ماڵ مامەم لە کەرکووکە[١]

ماڵ مامەم لە کەرکووکە
کەرکووکی کوردی کۆکە
دەکەین سەردانیان بەخێر
ئەوانیش دێن بۆ هەولێر
بەهۆی خزم و کەس و کار
دەبینین دێهات و شار
شار و دێی کوردستانم
بە مڵکی خۆم دەیزانم
لە زاخۆ تا خانەقین
نایە بۆنی ڕق و قین
پشت و پەنای یەکترین
بۆ یەک ئەژین و ئەمرین
نابینابێ نەیاران
کورد خەندان و کامەران

هەولێر - ٢٠٠٨/٨/٢٠

---

(١) لە ڕۆژنامەی (ئاشتی نامە) بڵاوکرایەوە

# بەفرو باران[١]

بەفرو باران بەکەڵکە
حەزو ئارەزووی خەڵکە
ڕووبار و جۆگە و کانی
زەمین و دەغڵ و دانی
باغ و سەوزە و میوەجات
کارۆکە و بەرخ و ماڵات
هەڵووژە و هەنار و توو
ماست و پەنیرو سەرتوو
دیمەنی سەوزە گیا
لە دەشت و شاخ و چیا
سەیران و ئاوی تەزی
دار و باری ناو ڕەزی
چی تر مایەی ژیانە
بەهۆی بەفرو بارانە
سا خوا بۆمان بڕەخسێ
بەڵام لافاو هەڵنەسێ

هەولێر – ٢٠٠٨/١٢/١

---

(١) لە ڕۆژنامەی (ئاشتی نامە) بڵاوکرایەوە

# من شەڕ ناکەم[١]

من شەڕ ناکەم خۆ ئاژەڵ نیم
نائارامیی ناو ئاوەڵ نیم
شەڕفرۆشی خەم و خەوشە
بۆ کۆمەڵگا زیانبەخشە
مرۆڤ خێرا نرخی ئەخزێ
خۆشەویستیی دائەبەزێ
ئەم لەوپەڕی سنوور ئەبێ
ڕق و قینە ئەستوور ئەبێ
شادی ئاسۆی ئاژاوەیە
نەهامەتی نەبڕاوەیە
ڕۆژێ ئەبێ پەشیمانی
بۆ ئایندە باش نەڕوانی
دڵخوازە ڕووی تەبایی
بژی ئاشتی بژی برایی

هەولێر - ٢٠١٠/٥/١٢

(١) لە گۆڤاری (مشکە) بڵاوکرایەوە

# چۆلەکە[١]

ئەی چۆلەکەی سیواندە
دڵم مەشکێنە هێندە
هەر من دێم تۆ هەڵئەفڕی
ساتێ وچان ناگری
هەرگیز لە من مەترسە
لە بزەی لێو بپرسە
چەند تۆم ئەوێ چۆلەکە
شادیم لەلای چۆل مەکە
لە باوەشت وەردێنم
دان و ئاوت بۆ دێنم
تێر تێر نۆشی گیانت بێ
جەژن چێژی ژیانت بێ
بۆت بێژم سا گۆرانی
بەختیار بی تا بەیانی
ئەوسا بەرەڵڵات ئەکەم
ئەسپاردەی خودات ئەکەم

هەولێر - ٢٠١١/١/٣

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

# بەفر[1]

بەفرەو ژیان زۆر سەختە
خاک داپۆشیوە شەختە
هوشیار نەبی ئەخلیسکێی
کەس نازانێ ئەوسا کێی
لەناو بەفرا لوول ئەبی
کزۆڵ و مەلوول ئەبی
کە هەستایەوە سەر پێ
دڵەکەت دادەخورپێ
بۆ بەفرو فرە کەڵکی
بۆ زەرعات و گشت خەڵکی
ڤایرۆس کوژو سوود بەخش
ڕووەک ئەیهێنێ نەخش
دڵان ئاوەدان ئەبێ
هەژار شادمان ئەبێ

هەولێر – ٢٠١٣/١/٨

(١) لە گۆڤاری (گوڵەکان) بڵاوکرایەوە

# بەڵێن[١]

باوكە بەڵێن بێ چیتر
دڵت نەشكێنم ئیتر
بەهەموو حەزو تاسەم
بۆ فەرمانت ئامادەم
نەزانینە سەرپێچی
ئاریشە ڕائەپێچی
شەڕو ئاژاوەی ماڵێ
بەختیاری ڕائەماڵێ
زارووكانی بێنازی
ناچنە دەرێ بۆ وازی
هەراسان لە قوتابخانە
كامەرانی خەمیانە
من كردوومە بە پیشە
ملكەچت بم هەمیشە
بەهارە ماڵئاوابێ
پاییزی لێ ئاوابێ

هەولێر - ٢٠١٣/٤/٦

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوكرایەوە

# مۆتا[١]

ئاگادار بە کاک کارزان
نەساغ نەبی وەک کاروان
کەم بایەخ بوو لە ساردی
بۆی برد دەمی هەرچی دی
ژێر سپلیت خەوتنی بوو
نارادەبەریی بیر چوو
دووچاری بوو لەرزوتا
لە سوێی چلوورە و مۆتا
لەناو ئاوەڵان بزر
شێوا شێوازەی هزر
گشت یاریی فەرامۆش کرد
دایە و بابەی پەرۆش کرد
دکتۆر و داروخانە
پیشە دەرزی لێدانە
کەم هاتەوە هۆش خۆ
بەی بەی لە مۆتای کرد خۆ

هەولێر - ٢٠١٣/٦/٢٤

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

# باران[١]

خوایە بباریێ باران
پیتر لە جاری جاران
ئاو زۆر دەبێ بۆ داهات
شاد دەبێ شارو دێهات
زوو زوو خۆمان دەشۆرین
بەرگ و پۆشاک دەگۆڕین
کەل و پەلی ماڵ خاوێن
بۆ خەندە فرە هەوێن
گوڵ و درەخت و چیمەن
ئەبەخشێ نازی دیمەن
مامەی جووتیار بەختیار
بەزەرعات و زەوی و زار
خاک ئەکێڵێ و فەراهەم
وەبەردێنێ پاک بەرهەم
دەغڵ و دان و میوەجات
ئەنوێنێ چێژی نەبات

هەولێر -٢٠١٣/٧/٢٣

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

# شاخی حەمرین[١]

وەرە وەرە کاک حەمرین
برۆین بۆ شاخی حەمرین
نێوان کەرکووک و بەغدا
دوا سنووری کوردە
کوردیش خاوەنی خاکە
لە بەدکاری بێباکە
چاوی هەڵنایە پێمان
ئامادەیە بۆ پیلان
سامانمان لێ بسێنێ
سنوورمان ببەزێنێ
بۆ نەوتی شاری کەرکووک
داماوە بەزامی شووک
بێ کەڵکە ئەم تاوانە
پێشمەرگە پاسەوانە
پشتیوانی وڵاتە
شاڵاوی کارەساتە

هەولێر - ٢٠١٣/٨/٢

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

# بۆ قوتابخانەم ئامادەم[١]

بۆ قوتابخانەم ئامادەم
ڕازاوەی بیرمە هەردەم

زوو هەڵئەسم بەیانی
چاو ئەشۆم ئەخۆم نانی

سەیری جانتاکەم ئەکەم
نەبا هەبێ کورتی و کەم

لاستیک پەرتووک و پێنووس
ڕاستە و دادەر و تێنووس

لە بوونیان دڵنیا ئەبم
ئینجا بۆ فێرگە ئەچم

سڵاو لە قوتابیان ئەکەم
ڕوو ئەکەمە ڕیحلەکەم

کۆ ئەکەم پاکی هزرم
گۆ لە مامۆستام ئەگرم

هەولێر – ٢٠١٣/٩/١٧

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

# ژینگەپارێزی[١]

ئەرکە ژینگەپارێزی
پەیڕەوی کە تا ئەژی
بەخاک چاکە ڕەفتارکە
وەک ماڵی خۆت ئەژمارکە
کۆڵان و شەقامی شار
پاک و پەروەردەی گوڵزار
کۆنە و کاغەزی نەشیاو
میوەجاتی بۆن گەناو
فڕێ مەدە سەر زەوی
خۆشت لە ئاست ناسرەوی
بیخە ناو دەبەی زبڵ
جوان دەبی وەک سوورە گوڵ
بابسازێ خاوێنی
ژینگە بێنی مزگێنی
بۆ دەرزی و دکتۆر ناچین
سڵامەت و ساغ ئەژین

هەولێر - ٢٠١٣/١١/٢٧

---

(١) لە گۆڤاری (جگەرگۆشەکان) بڵاوکرایەوە

# نەورۆز[1]

نەورۆزە و خەڵکی شادە
گەورە و بچووک ئامادە
بۆ سەیرانی شاخ و کێو
لە هەورازا یا نشێو
بەرگی تازە ئەپۆشین
ڕەنگی زەرد و سەوز و شین
کام خۆراک خۆش و خاسە
ئەینۆشین پڕ بە تاسە
جا دێ نۆرەی فتبۆڵێن
گۆرانی و نوکتە و هەڵێن
گەورەکانیش بەختیار
بەهەڵپەڕکێ و لالەزار
ڕۆژگار کاتی کۆتایی
دەستبەردارە لە شایی
بۆ ماڵ ئەگەڕێینەوە
ئەمرۆژی ئەڵێینەوە

هەولێر - ٢٠١٣/١٢/١٨

---

(١) لە گۆڤاری (گوڵەکان) بڵاوکرایەوە

# دایە و بابە[١]

فەرمانی دایە و بابە
ئامۆژگاری نایابە
ملکەچبوونی پێویستە
بەڵگەی هەڵوێست و هەستە
خاوەن ئەزموون و ژیرن
وتەکانیان دڵگیرن
بۆ ژیانمان ڕابەرن
کێشە و ئاستەنگ لابەرن
حەز ئەکەن ڕۆشنبیربین
لە تەمتومانا دیر بین
مرۆڤێ بین بە کەڵک
بۆ خۆمان و بۆ خەڵک
نیشتمان ئاوەدان بێ
ڕۆژگار سەیرو سەیران بێ

هەولێر - ٢٠١٥/٥/٢٨

---

(١) لە گۆڤاری (گوڵەکان) بڵاوکرایەوە

# کارەبا[١]

هێزو وزەی کارەبا
تاریکی ژین لادەبا
شەوگار ئەکا بە ڕۆژگار
ڕۆژگارێکی بەختیار
گەرم و گوڕی هاوینە
لە ڕێبەندان ببینە
هەوای ساردی کوێستانی
لە تەموزا ئەیزانی
تیلیفریک و گەشتی شاخ
ڕوو لە ئۆخەی پشت لە ئاخ
بۆ ماڵ کۆمەکی پتر
ئوتوو و جلشۆر و هیتر
وێڕای کەڵک و شادانە
شتێک هەیە بیزانە
دوژمنێکە بێ مروەت
ئامادەیە بۆ هەڵمەت
شاڵاوی بێ ڕەحمانە
دەرفەت نادا بۆ هانا

هەولێر - ٢٠١٥/٧/٣

(١) لە گۆڤاری (جگەرگۆشەکان) بڵاوکرایەوە

# نوێژ ئەکەم[1]

نوێژ ئەکەم بەردەوام
ئەرکی ئایینی ئیسلام
ئەنجامدانی پێنج فەرزە
نک خودێ پایەی بەرزە
لە منداڵی فێر نەبم
بە مەزنی چۆن بۆی دەچم
ئاسوودەگی ئەنوێنێ
بۆنی بەهەشت ئەهێنێ
لە تەک نەفرەت لە گوناه
چاکە ڕەفتار بێ پەناه
نەڕەنجێ دایە و بابە
خۆم بە خۆم بێژم ڕابە
ئاوەڵ و خزم و خوێش
نە سوێ لە دڵ زام و ئێش
خاوێنی جەستە و پۆشاک
هێما بێ بۆ ناخی پاک
موسڵمان گەر وائەبێ
باغی ژین ئاوا ئەبێ

هەولێر - ٢٠١٥/١١/١٤

---

(١) لە گۆڤاری (جگەرگۆشەکان) بڵاوکرایەوە

# سێو[١]

سێو میوەیەکی خۆشە
بە پەلکەوە بینۆشە
بۆ کۆ ئەندام و هەرس
کاریگەرە نەک وەرس
ڤیتامین (سی) لەگەڵ (دی)
لە سێوا بۆت دێتە دی
چالاک بەخشە بۆ جەستە
مۆخ و خوێنی مەبەستە
سێوێ بخۆ ڕۆژانە
خۆشبەختانەی ژیانە
سێوە لا سوورەی ڕۆستێ
دژ بە ڤایرۆس دەوەستێ
هەر سێوێ لەهەر ڕەنگێ
ئارەزووت بۆی دەلەنگێ
پێشکەشی کە و بیزانە
شایستەی ئازیزانە
دیمەنی باغاتی سێو
دەڕازێنێتەوە کێو

هەولێر - ٢٠١٦/٢/١٤

(١) لە گۆڤاری (جگەرگۆشەکان) بڵاوکرایەوە

# ڕەمەزان[١]

گەرچی بچووکم بابە
تکا کارم وریابە
ڕێزی ڕەمەزان ئەگرم
ڕۆژانێکی لێ ئەگرم
پارشێو هەڵم ستێنەوە
دڵم بحەسێنەوە
لەگەڵ خۆتا نان ئەخۆم
ئەخەفم ئەوسا بۆ خۆم
تازوو بۆ فێرگە ڕابم
جێی دێڵم دایە و بابم
فەرمایشتی مامۆستا
کاریگەرە لە هەستا
هەر لە دەروازەی ماڵێ
ناشنگیم ڕادەماڵێ
نوێژی نیوەڕۆ ئەکەم
سەرخەوێکی بۆ ئەکەم
وانەم بەجێ ئەهێنم
چەند ئایەتێ ئەخوێنم
بۆ مزگەوتێ ڕێ ئەکەم
ڕەمەزان بەڕێ ئەکەم

هەولێر – ٢٠١٦/٣/٤

(١) لە گۆڤاری (گوڵەکان) بڵاوکرایەوە

# کاکم[(١)]

برای گەورە کاکمە
پلەیەک پاش باوکمە
گەر لە ماڵ نەبوو بابم
بۆ کاکم ئەبێ ڕابم
فەرموودەی بەجێ دێنم
دڵەکەی ڕادەژێنم
کاری ماڵ بێ یان بازار
چوست بۆی ئەچم نەک بێکار
خانەوادە بەختیار بێ
ڕەنگدانەوەی دیار بێ
خزم و دراوسێ و ناسیاو
شادانە بڵێن سڵاو
تەمەن درێژ بی ڕۆڵە
ماڵتان بێ بۆڵە بۆڵە
کاشکی پاکی منداڵێ
پەژارەی ڕادەماڵێ

هەولێر - ٢٠١٦/٦/٥

---

(١) لە گۆڤاری (جگەرگۆشەکان) بڵاوکرایەوە

# دایکم نەخۆشە[١]

ئیمڕۆ دایکم نەخۆشە
بۆ کۆمەڵ بە پەرۆشە
بان چاوانم هاوکاری
دەستووری کوردەواری
شایستەی لاواندنەوەی
شاڵاوی دڵدانەوەی
شەوارە و شەونخونی
ڕۆژگار تاریک و ڕوونی
بۆ سێ ژەمەی خۆراکم
بۆ خاوێنی پۆشاکم
بەڕێکەوم بۆ فێرگە
زانستی تازەم فێرکا
نایەڵم سەری بێشێ

(١) لە گۆڤاری (جگەرگۆشەکان) بڵاوکرایەوە

ئاستەنگیی بێتە پێشێ
ئەیدەم ئەنجامی دەرحاڵ
پاک کاروباری ناوماڵ
خێرا ئەهێنم هەتوان
چارەسەر و پاسەوان
بخزێ نا تەندروستی
لەناو پێخەف هەڵبستی
قوربانی تۆمە دایە
بیهێڵە بۆم خودایە

هەولێر - ٢٠١٦/٩/١٠

# ئاو[1]

دەقی پیرۆزی قورئان
ئاشکار ئێژێ بە ئینسان
ئاوە ڕۆح زیندەوەری
سەرچاوەی بەختەوەری
لە ئاو هاتووینە کایە
مەزنترین سەرمایە
شاد دەبێ پاک جووتیارێ
باران کاتێ دەبارێ
چەشن و توخمانی زەرعات
چالاکیی گەشە ئەکات
بەرهەم خۆراکی بە تین
بەهەڵپەوە بۆی ئەچین
موخابن چەندین ساڵە
وشکەساڵی وا زاڵە
باران ئەبینرێ کەم کەم
دڵان دایدەپۆشێ تەم
نزای ئێوە قەبووڵە
ئامۆژگاریم بێ: ڕۆڵە
دەس بڵندکەن بۆ ئاسمان
خودا بباری باران

هەولێر – ٢٠١٦/١١/٢٤

---

(١) لە گۆڤاری (گوڵەکان) بڵاوکرایەوە

# ماڵی خۆم[١]

من ماڵی خۆم پێخۆشە
جیهانێکی خامۆشە
نەخوازەلا تەبایی
کانیاوە بێ کۆتایی
دایک و باوک و براو خوشک
جیاوازیان نییە بێ شک
خۆشەویستی ئەوپەڕی
بەرجەستەیە و دەردەبڕێ
هێزی نەوازش و سۆز
ئاوێزانە بۆ نەورۆز
گەشت و گوزارە و شادی
لە ماڵا بۆت دێتە دی
ئارامترین شوێن بۆ خۆم
ماڵی خۆمە و ماڵی خۆم

هەولێر - ٢٠١٦/١٢/٢٧

---

(١) لە گۆڤاری (جگەرگۆشەکان) بڵاوکرایەوە

# خۆرەتاوە

سەدو پەنجاو دوو ملیۆن
کیلۆمەترە و ڕێک و ڕۆن
میان ئێمەو خۆرەتاو
ئەیبەخشێ تیشکی پڕ تاو
هەوار بدرەوشێتەوە
زەرعات ببووژێتەوە
گوزەران دەستەبەر بێ
ژین سەیران و سەفەر بێ
وەبەرهێنان وزەی زۆر
لە جەنگا بێ لە تەک خۆر
پرسێ دێتە کایەوە
تیشک چۆن نەبڕایەوە
چ نهێنییە لە ئارا
توانای کردگارە

هەولێر - ٢٠١٧/٣/١١

# زانست

ڕۆڵە ڕوو لە زانست کە
هزرت بە شیلەی مەست کە
دووری لە دامەنگیری
لە باوەش ڕووناکبیری
جیهانی جوانی خاکی
پڕ بەخشش و چالاکی
دایە و بابە شادمان
دەست هەڵئەبڕن بۆ ئاسمان
تەمەن درێژبی ڕۆڵە
هەنگاوت نا بۆ تۆڵە
منالی و ناز پەروەری
لاویمان لە گوڵ بەری
بڕزاێنەوە وڵات
بەسەربەخۆیی و خەڵات
عەتری سەرکەوتن بژێ
دووچاوی دوژمن بڕژێ

هەولێر – ٢٠١٧/٣/١٣

# خۆراك

زێدەڕۆیی لە خۆراک
دۆشداو دەتمێنێ خەمناک
گەدە بۆی ناکرێ هەرس
لە گیانی خۆی زۆر وەرس
ژان و ئازار دەیگرێ
لە ناخیا دەبتە گرێ
بۆ هێشتم بێتە ژووری
هەستم لە خۆم ئەبووری؟
تەواوی جەستە و ئەندام
ئەیشێوێنی سەرەنجام
مەدهۆش و کەم خەو ئەبێ
تەمبەڵ و قەڵە و ئەبێ
قەڵەویش نەخۆشییە
نا ئۆقرە نا ڕەوشییە

هەولێر – ٢٠١٧/٤/٨

# ڕێزگرتن

بەم سەروەرییەی خۆی یەزدان
ڕێزی ناوە لە ئینسان
سپی بوو قژی کەمێ
بۆ خۆی لێی دەکا شەرمێ
من قەدر چلۆن نەگرم
فەرمانی پاک بان سەرم
بگرم گەر نرخی خەڵک
بۆ خۆم بڵندییە و کەڵک
پانتایی خۆشەویستی
فراوان دەبێ هەستی
خەندە بەرجەستە دەبێ
خەم قامک گەستە دەبێ
شەقامی ژین ڕوون دەبێ
ئارامیی دەروون دەبێ
خاک دەیگرێ لەنگەر گشت
نەیار ناسەنگ و ناپشت

هەولێر - ٢٠١٧/٥/١٣

# زەردەی ئێوارە

نووسینی: سامی ڕواندزی



# زەردەی ئێوارە

نووسینی: سامی ڕواندزی

# ئاو و ئیسراف[١]

دیم لە گەڕەکی مفتی
سەر ئەسڵەعی وەک شفتی
کۆترەباریکەی هەولێر!
هەست ناسک یادی بەخێر!
لە چاویدا چاوێلکە
لەرزۆک نزیک ئاوێلکە
سینە ڕووت مل و پشتی
خەملاوە بە تووک گشتی
سۆندەی سوور بەدەستەوە
ڕێی لە ڕێبوار بەستەوە[٢]
گشت ئەیڕشاند حەوت هەشت جار
بۆ سەیران درەخت و دار
وەرگێڕا ڕووی بۆ کۆڵان
تۆپ و ساحەی منداڵان
جۆگە و قوڕ و سیانی
کۆشک و سەرا و سەربانی
کرمی ئارەزووی مراند

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

(٢) سوود لە هۆنراوەیەکی فۆلکلۆر وەرگیراوە

جاحێڵ ئاسا خۆی نواند
لەم ئاژاوە مەپرسە
هەڵوێستێکی بەترسە
کارەبا کوژایەوە
فەشەل بوو گەڕایەوە

* * *

بنەمای ژیانە ئاو
ناز پەروەرەی ڕۆح و چاو
نەچێ بەهەدەر پشکێ
ناڵێک نینۆکت بشکێ
سڵامەت بی هەر بژی
تانکیت هەردی بەتژی
بگرەوە شێرە خێرا
لە ڕووی شیرعەوەش خێرە
ئاو ئیسراف ستەمە
نەهامەتیی بەستەمە
گوڵ و عەتر قڕ دەبێ
بولبول دڵی پڕ دەبێ
تووڕە دەبێ و دەبڕێتەوە
بەچاو نابیندرێتەوە

هەولێر - ٢٠٠٧/٢/٢٦

# چاو[١]

ڕۆحەکەم و چاوەکەم
دوو وشەی خۆشەویستی
دەبرێ بۆ شایستە
خودانی ئەگەر ویستی

❊ ❊ ❊

پلەی دووی بەرکەوتووە
چاو چرای گەشاوەیە
تەن سوپای سەرکەوتووە
ڕۆح ئاڵای شەکاوەیە

❊ ❊ ❊

بە پەنهانی ڕەوشەنێ
لە دیدەی نابینایە
ئەکوتێ پەل، ئەدا ئاکام
ئاسۆیەک لە دڵدایە

❊ ❊ ❊

ئەبێسێ خێرا و گوهسووک
هەستیارە و عەقڵ حیا

---

(١)لە گۆڤاری (هاوبەش) بڵاوکرایەوە

دەگرێ لە دوندا ئارام
سەنگ بێ زانست وەک چیا

* * *

نەزەر نەزان و ناشی
ئاسا پێوەی گرفتار
خەڵاتی خوایە بەهەشت
فەرمایشتە نەک گفتار

هەولێر – ٢٠٠٧/٥/٤

# ملیۆن ساڵ!![1]

بەهـ چەند بە بەخت و ئیقباڵم ئەمن
نە دوو باڵ خودان سەد باڵم ئەمن
شەست و حەوت سژاڵە هەر پێئەکەنم
لە تانوپۆدا خەم هەڵئەکەنم
بە ڕۆژی گۆڕیوە خەندانیم شەو
چۆن بێ تاسەی ئارامی خەون و خەو؟!
ئەمموستیلەکەی حەزرەت سلێمان
شەپۆڵ ئەبەخشێ کازێوەی لێمان
مەبەستی فرە، مەرامی خێرا
ئازا ئەوەستێ ئاهـ ئەڵێم کێڕا
لە دیەم دەبارێ سێڵاوی ڕۆندک
سێڵاوی شادی و گوڵزار و چەپک
بە ژن و باڵاکەت وا خەملاوە خەم
گوڵێکت تاوێ بیدە لە یەخەم
بکەم تێر بۆنی میسک و عەنبەری
لە گۆ کپ بێ پەیقی بەختەوەری
گوشادم کوڕگەل خاوەنی ئیقباڵ
تەمەن باڵا بێ: بژیم ملیۆن ساڵ!!

هەولێر – ٢٠٠٨/٣/١٩

---

(١) لە ڕۆژنامەی (بەهرە) بڵاوکرایەوە

# پێت گوتم، پێم گوتی[(١)]

پێت گوتم: توخوا جوانم
پێم گوتی: بەخوا جوانی
پێت گوتم: کەم گاڵتەجاڕی
پێم گوتی: ناشێ نایزانی!

❊ ❊ ❊

پێت گوتم: من ئاوەڵێکم
زمانی گرت و ناخی ڕشت
هەڵبژاردەی شوێنە زامی
جیلوە و ناز پەروەرمانی گشت

❊ ❊ ❊

پێم گوتی: بۆچ وازی وازی
نەبووە لە هەگبەت ئاوێنە؟
بگێڕە چاو بە کەیهاندا
لە نیگارتا کوانێ وێنە

❊ ❊ ❊

---

(١) لە ڕۆژنامەی (بەهرە) بڵاوکرایەوە

پێت گوتم: خولیا تەلاریێ
تەنراوە باڵای بە ئاڵتوون
دیدە ئاڵۆزە نارِوانیێ!
لووتی لە لووتکەیە خاتوون

❊ ❊ ❊

پێم گوتی: دەوڵەت و سامان
بەقەد قژت بۆی سازە قاسە
جوانی لەش و لار، دەژمێرری!!
تیرەو دەیپێکێ هەناسە

هەولێر – ٢٠٠٨/٥/٢٠

# ئاڵتوونی ڕەشپۆش[١]

داگرە دیدە، بسڕە لە ئێمە ئومێد
خزاوەتە ڕۆح ئامێز وڵات و زێد
لە بزەبزی هەرزەکارانەت.. ئۆقرێ
لە چاوێری مەستانە قژ شە ئەکرێ
تۆماری ئەزەلە دەست دامەنهۆش
بە کورد ڕەوایە ماف ئاڵتوونی ڕەشپۆش
چیم دەسەڵاتە لە پای ئەندازە و بەش
نەک هاوردە هامڕازە پەنهانی ڕەش
کوا پای هەڵوەدای بندارو درەختت؟
کوا جەلدەی ستەم لە ئیقباڵ و بەختت؟
لە تای تەرازووی دادی ویژدانەوە
سەروەرە دیە بۆ ئاوڕدانەوە
بۆ ئاوەڵت بژی و بخۆ مشووریٚ
لە شەقامی چەوتت بەشکو ببووریٚ
گوتوومە گفتم بە دار و بەردو خۆڵ
بسویٚ بە ئاستەم گیان لە ڕەفتار و شۆڵ
نەوت پیرۆزە و حەمایلە و بازوبەندم
بوار ناشیٚ خێرا بۆ فەر کار بەندم
هزرە، خەیاڵتە، کەرکووکی جگەربڕ
وەک (زیرەک) ئاسا: سوێند بە باوەگوڕگوڕ

هەولێر - ٢٠٠٩/٤/١٥

(١) لە ڕۆژنامەی (ئاڵای ئازادی - هەولێر) بڵاوکرایەوە

# هەڵبژاردن[١]

بۆ عەداڵەتی گوڵ هەڵدەبژێرم
من سلێمانیم ئەمن هەولێرم
ئەژیٚ دهۆکم هاوخەم و خەبات
کۆمەڵایەتی بچێژیٚ ئاوات

❊ ❊ ❊

هەڵبژاردنە کوڕگەل ئازادە
خۆ سەلماندنە دەروون پێی شادە
بچۆ مەڵبەندی دەنگدان بەپەلە
باغ بخەملێنە بۆ بەرهەم هەلە

❊ ❊ ❊

چرای داد دنیا پێوەی ڕووناکە
نەشیاو نەدیدەم بێژم هیلاکە
تینوەتیی ئێمە دەسی چاکسازە
بخزێتە ئامێز ئەم ڕاز و سازە

❊ ❊ ❊

---

(١) لە ڕۆژنامەی (ئاشتی نامە) بڵاوکرایەوە

کۆگا لێواولێو تاساوە داهات
خەمبارە خەڵک خەرمان خەرابات
هێلین لانەواز ناحەزی ڕەوشە
شەرمە هەژاری، بۆ سەردەم خەوشە!!

❊ ❊ ❊

سەرمان بڵندە کارامەی وڵات
ملکەچ پەیمان بێ و نەبەزێ پێشهات
ڕووە جوانەکەی جوانکا نەداران
بە شایستەوە بکرێ گوڵباران

هەولێر - ٢٠٠٩/٥/١٨

# ئەی دڵ[١]

ئەی دڵ دەزانم لە من بە قینی
هێندەت نەماوە چاوم دەربێنی
پێم دەڵێی بۆچی هەردەم نەساغی
بەلەش لاواز و هەڵکێشی ئاخی
هەردەم داماوی لێوت بە بارە
ئەبێ ئامانجت دیدەنی یارە؟
تەمەنت گەیی بە هەژدەساڵان
قەت نەتدی خۆشی ئەی یانە وێران
ئەی دڵ شاعیرم شاعیر هەر ئەبێ
بەشی نەگبەتی و ئازاری سەر بێ
کەچی دڵەکەم هەر چەند هەژار بم
هیچ یارم ناوێ بە هەر غەمبار بم
بەڵام کە وشەی ئەم کوردستانە
هاتە بەر گوێما بەبێ گومانە
بە جارێ خەفەت لەلای من ئەبا
ئەمباتن بەرەو گۆرانی و سەما
پەیمان ئەوەیە لە ڕێگەی وڵات
ماڵ و ڕۆحەکەم بکەم بە خەڵات

هەولێر – ١٩٦٠/٥/٢٢

---

(١) ئەم شیعرە لە مێژینەم لە کەشکۆڵی گیو بەرگی یەکەم ساڵی (١٩٨٥)دا بڵاوکرایەوە با وەکو شتێکی ئەو کۆنییە وەلێ بۆ یادگار مافم پێی داوە لەم پەڕاوەدا تۆمارم کرد.

# لاوی و پیری[١]

وەرزی لاویم ئەتارێنم
هۆن هۆن دڵۆپ ئەبارێنم
ئاوەڵم بوو: شمشاڵی شوان
ناز و جیلوەی خەوی شەوان

❊ ❊ ❊

هەناسەی شاد، بەستەی تازە
هێزی بازوو، نوقمی تاسە
پەیامی یار، شووشەی گوڵاو
بزەی لێو و، چاوی حەلاو

❊ ❊ ❊

هەڵهەلەی کچ، دەنگی دەهۆڵ
گەشت و داوەت، لە چیا و چۆڵ
هاژەی ڕووبار، جریوەی مەل
دەشنایەوە، پۆلی بەرغەل

❊ ❊ ❊

---

(١) لە ڕۆژنامەی (ئاشتی نامە) بڵاوکرایەوە

سروەی کۆست و گەڵا وەری
وشکەساڵە، لە خۆی بەری
بوون بە جەللاد، کۆمەڵێ خەم
زام و پیری، دەستەو یەخەم

* * *

چاو ئەگێڕم، ڕۆژ ئەژمێرم
هەنگاو دوودڵ، کوا ئەوێرم؟
چاڵی نەمان، چۆنە ڕەوشی
وەرزی لاویم، پێ ئەبەخشی؟

هەولێر – ٢٠٠٩/١٢/٢ لەسەر داواکاری م. باکووری

## بەهەشت[١]

لەچاوتایە ئەوجێ گوزارە و گەشت
بەهار و کانی و لالەزار و وەشت
نیگاری باڵای خواوەندی.. بەهەشت

❊ ❊ ❊

پەری پەپوولە ئاسا ناسکتر
جیلوەی پەنجەیێ لە خۆرا پتر
شۆخانی زەمین ملکەچن ئیتر

❊ ❊ ❊

لێواولێو تژی بابەت لە شێوە
ناشێ بە ئەژمار سەوزایی و مێوە
باغی ئیرەمی هەنار و سێوە

❊ ❊ ❊

---

(١) لە گۆڤاری (پەیامی ڕاستی) بڵاوکرایەوە

بۆ بەندەواری بەهەشت دەرفەتە
ڕۆژگاری ڕووناک نەیدا لە پەتا
میکانیزمی ساز هەوڵ و هیممەتە

❊ ❊ ❊

بۆ دەمتا دەژیێ گفتاری ڕاسە
پا تا دەجووڵێ ڕەفتاری خاسە
بەرنامە تا گۆڕ کردگار ناسە

❊ ❊ ❊

بێئاگا لە خوا کەم هۆش و گۆشە
پیتۆڵ بێ نازی وەک دەهۆڵ بۆشە
ئەخلیسکێ قاچی ژێرزەمین نۆشە

❊ ❊ ❊

هاکا هەڵقەنا درەختی تەمەن
قاڕوون دووەم بی پووڵت بێ بە تەن
گەردوون ئەیسەنێ و جێی ئەهێڵێ تەن

هەولێر – ٢٠١١/١١/٤

# بۆ شاعیر[١]

شاعیری جوان و شاعیر جوانی
شتێک بڵێم پێت: پەردەی پەنهانی
چەنێ وەختێکە خۆی هەڵماڵیوە
قێزەوەن مەستە و خونچەی خەملبوە!
کام ڕۆحییەت بۆ پەیمانی پاک
تنۆکی خوێنی دەنەخشێنی خاک؟
کام دڵ و نیهاد بۆ بابە و دایە
جێ ئەهێڵی تەم پڕ چەتروسایە؟
کام دەسلەملانێی هاوسێ و قەوم و خوێش
لە پای سەرابا دەپڕژێ زارو ئێش؟
دەوڵەت و سامان ئاڵتوونی پتر
دەیکا گڕاوی بە ساقەی ئیتر؟
وادەی سەرنخوون شەتڵی دڵداری
بێناز ئەڕێژی ئەشکی مرواری!
تاسەی هەندەران ئاواتی ئافرەت

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

یانە خانەی گوڵ عەشرەت بە نەفرەت!
موڵکێتی پیاو ناشێ بۆ هیچ کەس
ژنە سەرچاوەی ئامراز و هەوەس!
شاعیری جوان، شاعیر بەدبەختە
هۆمای لە ئەوجە هەڵکشان سەختە

هەولێر – ٢٠١٢/٧/٨

# بۆ مەرگی مامۆستا
# مەلا محمد أمین رواندزی[١]

مەرگی مامۆستا محەمەد ئەمین
کۆستە بۆ ئێمە و بەختە بۆ زەمین
هەولێر دژ دامان ڕواندز بۆی گریا
گەورە مەلا بوو بە زانست خولیا
بۆ کوردایەتی شیعری نووسیوە
حەزو ئارەزووی لە دڵ چەسپیوە
بەخشینی خوایێ هەمواری بەهەشت
بۆن و ئاوێزان لالەزار و گەشت
حەڤدەی یازدەی دووهەزار و دوانزە
ڕۆژگارێ لێڵە و فەنەری کزە

هەولێر – ٢٠١٢/١١/٢١

(١) لە گۆڤاری (نوالەی نوێ) بڵاوکرایەوە

# بارزانی نەمر[١]

نەبوو باکی لە باڵەفڕو ئاگر
کوڕی شاخ بوو خەیاڵ بەرزو خۆڕاگر
ئومێد باڵا لە هزری بەدکار پتر
ڕوونە ئاسۆ ئەیزانی بارزانی نەمر

❊ ❊ ❊

چەکی نایە سەر شانە مەردانەکەی
شیو و شاخ گشت شادان بەسەردانەکەی
هەر کوڕە کوردە و هاتە مەیدانەکەی
(با بڕووخێ) بوو دروشم و وانەکەی

❊ ❊ ❊

وەک ورچەکە لە ترسی باڵدارەکە
لەرزی دوژمن لە چنگاڵە بێزارەکە
شەرمەزاریی شکستەی ناچارەکە
ئازادە کورد جاڕ ئەدا بڕیارەکە

هەولێر - ٢٠١٣/٣/١

---

(١) لە گۆڤاری (گوڵەکان) بڵاوکرایەوە

# خەیاڵ[١]

دیاری بۆ لاوان «کچ و کوڕ»

چاوی ڕەشی قەترانی
لێوی تەنکی قەیتانی
نیازی ئەوجی ڕازم
خودا ببمە خودانی
ڕامووسانی خاڵەکەی
دەس بە باغی بەیانی
دوگمە و یاخە واڵا بێ
هاتوچۆی بێ لە خانی
تیشکی تیلای دیدەکەی
ئەفسوونی سەر لێوانی
جۆش سبەنێ دەمەکەی
لە سایەی ئاوێزانی
ئاڵتوون بکا بە بەریا
زرینگەی بێ لەرزانی

---

(١) لە گۆڤاری (نواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

بگرم دەسە خاسەکە

بۆ بۆکان و سەرکانی

شیر و نەبات و نوقڵ

باڵا گۆش نۆشی گیانی

ڕواندز و مەهاباد

دایمرکێنی چاوانی

بێتە کوڵ ((حەیرانی تۆم

بەهای ئەڤین ئەزانی

دڵ مڵکی خۆتە و ملکەچ

تاکۆتای زیندەگانی

خەتا گرژیی نەئاڵێ

تەوق و قاچی زیندانی

خانەوادە ئارام بێ

گەلاوێژ بێ ئاسمانی))

هەولێر - ٢٠١٣/٣/٢٤

# بە بۆنەی دەرهاتنی پێشەوا لە تیمارخانە[1]

ئەمڕۆ جەژنی گەلمانە
ڕۆژ شادی و ڕەندانە

سەرۆکی خۆشەویستن
دەرهات لە تیمارخانە

جا دەهەستن لاوەکان
لە نێو خاکی کوردستان

دەست کەن بە شایی کوردی
لە نێو گوڵ و گوڵزاران

ئێوەش خوشکانی دلێر
لەگەڵ براکانی شێر

شایی ڕەشبەڵەک بکەن
با دوژمن بێت سەرەوژێر

عەبدولکەریمی نەبەز
هەردەم بێ ترس و لەرز

خەباتی کردووە و ئەیکا
لە پێناوی ژیانی بەرز

دوژمنەکانی میللەت
نەمان وا بوونە لەتلەت

بەهۆی هەوڵی گەلی کورد
هەم عەرەبی بە عزەت

کورد و عەرەب دەمێکە
برایەتیان زۆر ڕێکە

خەباتی هەردووکیان
تەنیا بۆ ئامانجێکە

خوایە هەر بژی بۆمان
کاک کەریمی قارەمان

ڕۆڵەی نەبەز وەک کاوە
ئازادکەری نیشتمان

---

(١) هۆنراوەی هەڕەتی هەرزەکاریم لە گۆڤاری (هەتاو) بڵاوکرایەوە

# خۆزگەم[١]

خۆزگەم بەم ڕۆژەی هاتی بۆ ماڵمان
ئەمن نەخۆش بووم پرسیت ئەحواڵمان
قدوومت خێر بوو بۆ ڕەوشی تاڵمان
شیفای دەردم هات دەست نا بە باڵمان

❊ ❊ ❊

بە گۆشە نیگات ماڵمان پیرۆز بوو
بەهار پێکەنی و مژدەی نەورۆز بوو
قەسری ماقووڵان لام کەلاوەیە
مفەرکی شارە و قاپی کراوەیە

❊ ❊ ❊

گومانم دەکرد سەردانم بکەی
لە حاڵی مەرگا شادانم بکەی
تەوقی خەتەری زیندانی بکەی
ئەوی ئاوارەی خەزانی بکەی

هەولێر - ٢٠١٤/٩/٢

---

(١) لە گۆڤاری (نەواڵەی نوێ) بڵاوکرایەوە

# ئازاده خاك[(١)]

ملی مێژووی مرۆڤایەتی
بە ئەفراندنی کوردایەتی
بە شنەی ملوانکەی گوڵ و مێخەک
ورەی بزاڤی دەست و مەچەک
خەملاوە بەهاری گەردنی
لە دوند خۆی دی بەر لە مردنی
دەسی ناسکی برد بۆ تفەنگ
لەجیاتی گوڵ کچە کوردی شەنگ
چل ملیۆن پتر لە دنیادا
کورد ستەمدیدەی نا ئازادە
بۆ ئاڵا لە ڕێی گرفتارە
لە چزووی چڕنووک بە ڕەفتارە
بتارێ تارای ئەشکی خەمینی
گەلانی شادانی ئاسا زەمینی
دووڕو بستامە شیعری بێکەسی
تاسەی نێرومێ دەست لەناودەسی

---

(١) لە گۆڤاری (جگەرگۆشەکان) بڵاوکرایەوە

دەستەوسانە مەرامی مەینەت
بەهێزی ویست و ئارەزووی پەت
ئاشنابوو کەیهان بە کەیبانی
خەملاوە بەخوێن دفنی جوانی
لە کوڕ بەگوڕتر کچ ها لە جەنگ
دەلەنگێ بۆی وەک هۆڵی جەفەنگ
بەدکاری شووم مەرگە شکستی
دەست بە ئەژنۆ پەستی نوشستی
کچ بەرەنگاری شاری گوللە بێ
ئازادە خاک بەد وەک کوللە بێ

هەولێر -٢٠١٤/١٢/٩

# پێشمەرگە[١]

پێشمەرگە ئازا و زاڵە
دوژمن لە ئاستی لاڵە
کردوویەتی بە پیشە
بۆ پێشڕەویی هەمیشە

❊ ❊ ❊

خۆی بە جیهانا ناسی
قەبووڵ ناکا کەساسی
کورد قەومێکە هەر ئەژێ
هەزار سوپا دابەزێ

❊ ❊ ❊

خاکی دێرینی وڵات
سەنگەرە و پۆڵا و قەڵات
بۆ چاو شکاندن وریا
پاشەکشەی ڕوو سیا

❊ ❊ ❊

پشت بە خواو بە پێشمەرگە
هارو هاجەی پێشدەرگە
لە خوێنی خۆی دەگەوزێ
بە سوێی هەیبەتی گورزێ

هەولێر - ٢٠١٤/١٢/٢٠

---

(١) لە گۆڤاری (جگەرگۆشەکان) بڵاوکرایەوە

# پێشمەرگە[١]

پێشمەرگەی کورد بۆ پێشەوە
ڕابە لە خەو تەم بسڕەوە
خاکی وڵات ڕایسپاردووی
تاریکە ژین وێنەی شەوە
هەڵمەت بەرە لاوی ئازا
سۆرانی بی یاخود زازا
خەمی تۆیە چۆن دڵت دێ
کۆبانێی جوان وا ناڵەی دێ
چەک هەڵگرە بە چەک جوانی
پڵنگ ئاسای بەرخودانی
گشت نیشتمان هیوای پێتە
هەڵکە چرا چاوەڕێتە
بەدکاری شووم باش ناتناسێ
چۆن خۆی بۆ پەت هەڵئەواسێ
بوەشێنە گورزی هیممەت
شەکاوە بێ ئاڵای میللەت

هەولێر – ٢٠١٤/١١/١٩

---

(١) لە گۆڤاری (گوڵەکان) بڵاوکرایەوە

## بۆ/ ئەیوبی جوانەمەرگ

سوا سەبرم سەروەرم ئەیوب
بۆ جوانەمەرگ حاجی ئەیوب
تەن تەندروست ڕۆح سڵامەت
هەڵیتەکاند بای قیامەت
خۆی ئەنوێنێ گڵکۆی تازە
لالەزاری مەستی نازە
خەفەت نەناسی جگەرگۆشە
دایە دانا خولیای گۆشە

هەولێر - ٢٠١٥/١١/١٦

# کوردستان[١]

کوردستانی نیشتمان
قەڵغانی تۆ بێ گشتمان
نیشتمانی پێشکەوتوو
خونچەی ئومێد پشکووتوو
سەرچاوەی مێژووت گەشە
پڕ خەبات و شۆڕشە
خۆرەتاوی تاسەی گەل
ئەڕازێنێتەوە کەل
بازووی ڕەنجی نەوجەوان
وەک خولیای باخی گوڵان
دروشمی کار کردنە
سستی ئەنجن ئەنجنە
کۆست و کۆسپی نالەبار
وردوخاشی کا تەلار
دەنگی زەنگی ئاسایش
وڵات بکا ئارایش
کۆشکی یەکسانی ژیان
ئاشکار ئەڵێ: کۆڵنەدان
وەک گەلانی کامەران
تێر بکەین سەیروسەیران

هەولێر - ٢٠١٦/٧/١

---

(١) لە گۆڤاری (گوڵەکان) بڵاوکرایەوە

# بۆ سەرانی کورد[1]

سەرانی کورد مەردانی گورد
هەڵکەوتووە هەل تەکانی گەل
نەیدەی لە تێخ بەزەبری بێخ
مێژوو ئاڵۆز نغرۆی باهۆز
هەل زێڕینە مەیزڕێنە
بیقۆزەوە بیدۆزەوە
ئەگەر کۆکی بۆ ناکۆکی
نەخشەی نەیار مانگە و دیار
بێ پێزو پشت ڕووخانی گشت
بگرێ بەرۆک دابنێین چۆک
دەرفەت پتر نالوێ ئیتر
هێزی مەچەک هانایە لەک
مەیخە قەفەس شنەی مەبەس
پڕ لە بریا کەشتیی دەریا
مەیخنکێنە خاک ببینە

هەولێر - ٢٠١٧/٥/٢١

(١) لە ڕۆژنامەی (هەولێر) بڵاوکرایەوە

ئـەم دیوانـە لەسـەر ئەرکـی خێزانـی شـاعیر لـە چـاپ دراوە و خوشـکی مامۆسـتا ئەقیلـە (ئاوێسـتا) ڕوانـدزی، کاری کۆکردنـەوە و پێداچوونـەوەی بـۆ بەرهەمـەکان کـردووە.

٢٠٢٤



خوالێخۆشبوو، مامۆستا سامی عەبدولقادر لەساڵی ١٩٤١دا، لە شاری دێرینی رواندز چاوی بە دونیا هەڵهێناوە. قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لەشارەکەیدا تەواو کردوە و لەشاری هەولێر وەک مامۆستا بڕوانامەی بەدەستهێناوە، لە ساڵی١٩٦١دا، لەرواندز دامەزراوە.

لەرێکەوتی٩-٦-١٩٦٣دا، لەلایەن میری فاشستی بەغدا دەستگیر دەکرێت، لەبەر ئەوەی سروودی نیشتمانی مارشی کوردستانی (ئەی رەقیب)ی بە قوتابیان گوتبۆوە، ماوەیەک زیندانی کراو ماوەیەکیش لە کارەکەی دوور خرایەوە.

● لە ساڵی ١٩٨٤دا، بۆ شاری هەولێر دەگوازرێتەوەو لە قوتابخانەی زانکۆ (مەلافەندی) دەست بەکاربووە.

● لە ساڵی ١٩٩١دا، لەسەر داوای خۆی خانەنیشینکراوە.

● مامۆستا سامی... هەر لەتەمەنی گەنجییەوە دەستی بە هۆنینەوەی هەڵبەست کردووە، وەک بەڕێزیان دەفەرمووێت (سروشتی جوانیی رواندز فێری نووسینی شیعری کردووە).

● نووسین و بەرهەمەکانی لە ڕۆژنامەو گۆڤارو بڵاوکراوەکاندا بڵاوکراونەتەوە و چەندین خەڵاتی دەستخۆشی وەرگرتووە .

● ئەو شاعیرە هەستناسکە لە ڕێکەوتی ٨-٦-٢٠١٧ دا، کۆچی دوایی کرد ، هەزاران چرا لەسەر گۆڕی بێت.

**ئەقیلا (ئاڤێستا) ڕواندزی**